زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست ( ٥٣ )

# چۆن ڕزگارت دەبێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط)؟


نوسینی

د. محمد بن ابراهیم النعیم

وەرگێڕانی

م. شاخەوان جەواد ئەحمەد

زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست (٥٣)

# چۆن ڕزگارت دەبێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط)؟


نوسینی:

د. محمّد بن إبراهیم النّعیم

وەرگێڕانی

م. شاخەوان جەواد ئەحمەد

پێش نوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی (سەید ئەحمەدی فەیلەسوف)

لە پیریادی - چەمچەماڵ



چاپی یەکەم

١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

ناوی پەرتووک

# چۆن ڕزگارت دەبێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط)؟


نوسینی

د. مُحمد بن إبراهيم النَعيم

وەرگێڕانی

م. شاخەوان جەواد ئەحمەد



چاپی یەکەم: ١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

ژمارەی سپاردن: ژمارە ( ٣٤٦ )ی ساڵی ( ٢٠٠٢ ) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە )





بنكەی بلاوكردنەوە

كتێبخانەی سیما

ژ.م. ٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩

كتێبخانەی سوننە
سلێمانی

كتێبخانەی سیما
چەمچەماڵ

كتێبخانەی زانست
كەلار

## پێشەکی

الحَمْدُ للّه رَبِّ العالَمينَ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِ الأنبياءِ وَالُمرسَلينَ نَبِّينـــا مُحَمَّدٍ، وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ، أما بَعْدُ:

موسڵمانی خۆشەویست بەڕاستی شارەزا بوون لـە حـاڵی دوارۆژوو ڕوودانـی ئـەو هـەموو کـارە نـاخۆش و ناڕەحەتانـەی کـە تیایدایـە، کارێکـە زۆربـەی موسڵمانان بێ ئاگان لێی، بەڕادەیەك وایان لـێ هـاتووە هـەر باسـی ناکـەن و بیریشی لێناکەنەوە، لە کاتێکدا زۆر شارەزاو خەم خۆرن لە کارو بـاری ژیـانی دونیا.

شارەزابوون و بە ئاگابوون لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط) یەکێکە لەو کارە گرنگانەی کە پێویستە موسڵمان بەردەوام بیری لێ بکاتەوەو لە یادی نەکات، چونکە بە هیچ شێوەیەك ڕزگار بوون نییە لە چوونە ناو دۆزەخ یان ڕۆیشتن بەسەریدا، هەروەك خوای پەروەردگار سوێند دەخوات کە دەبێت بەندەکانی بەناو دۆزەخدا بەرێت، هەروەك دەفەرمووێت:

﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ (مريم: ٧٢-٧٣).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئیللا دەبێت هەمووتان بـە نـاو ئـاگری دۆزەخـدا یـان بەسەر پردی (صِراط)دا تێپـەڕن، ئـەی مُحَمَّد (ﷺ) ئەمـە بڕیارێکـە لـە لایـەن پەروەردگارتەوە بڕاوەتەو شتێکی حەتمییە، پـاش چـوونە نـاو ئـاگری دۆزەخ یان ڕۆیشتن بەسەر پردی (صِراط)دا، پارێزگارو خواناسان ڕزگار دەکەین، وە زاڵم و ستەمکاران لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەستە و ئەژنۆ دێڵینەوە (بە چۆکدا

دەکەون و لە دۆزەخدا دەمێننەوە).

ڕۆیشتنی موسڵمان بەناو ئاگری دۆزەخدا بریتییە لە ڕۆیشتن بەسەر پردی (صِراط)دا نەك چوونە ناوی، وە ڕۆیشتنی هاوەڵ بڕیاردەران و بێباوەڕان بریتییە لە چوونە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەمە بۆچوونی زانای پایەبەرز (عَبدالرَّحمنِ کوڕی زَیدِ کوڕی أسْلَم)ـە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەروەك زانای پایەبەرز حافظِ حَکَمي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) گێڕاویێتیەوە [1].

قۆناغی تێپەڕبوون بەسەر پردی (صِـــراط) یەکێکە لە ترسناکترین ئەو ناخۆشی و ناڕەحەتییانەی کە ڕووبەڕووی موسڵمان دەبێتەوە لە دواڕۆژدا، وە موسڵمان ترس و لەرزوو دڵە ڕاوکێی ئارام نابێتەوە تا لەو پردە ڕزگاری نەبێت و بە جێی نەهێڵێت و نەکەوێتە پشتییەوە.

پێشبڕکێی ڕاستەقینەو یەکلاکەرەوە لە نێوان خەڵکیدا ئەوەیە کەلەسەر پردی (صِراط) ڕوو دەدات نەك لە دونیا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾ (یـــس: ٦٦).

واتــە: خــۆ ئەگــەر بمانــەوێت نــەبینن، ئــەوە ئاســەواری چاوەکانیشیانمان نەدەهێشت تا نەبینن، ئەو کاتە پێشبڕکێیان کرد بەرەو ڕێگاکە ڕێگای پردی (صِراط) تا بیبڕن و بیپەڕنەوە، بەڵام چۆن دەتوانن بیپەڕنەوە لە کاتێکدا ئێمە کوێرمان کردبێتن.

بۆیە هەر موسڵمانێك بە سەلامەتی ئەو قۆناغە ببڕێت و بەسەر ئەو پردەدا

---

[1] بڕوانە: مَعارِجُ القَبول لِلحافِظ الحَکَمي (٢/٨٥٣).

تێپەڕێت، ئەوە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بووەو بە هەمیشەیی سەرفراز بووە.

دەی کەوابوو موسڵمانی خۆشەویست چیت ئامادەکردووە بۆ ڕزگار بوونت لەو هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییانەی کە لەسەر پردی (صِـــراط) دێتـەڕێت؟ سوێند بە خوای پەروەردگار کارەکە زۆر ترسناکەو گاڵتـە نییـە، چونکە یان ڕزگار بوونە لێی، یان کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخی زۆر سوتێنەری بە ئێش و ئازارە.

موسـڵمانی خۆشەویست لـەم کیتابـەی بەردەستتدا هـەوڵم داوە تیشکێك بخەمە سەر ناخۆشی و ناڕەحەتی و ترسناکی پردی (صِـــراط)، ئـەویش لـە **چوار بەشدا:**

**بەشی یەکەم:** پێناسەی پردی (صِراط) و ناڕەحەتییەکانی.

**بەشی دووەم:** ناخۆشی و سووتانی سەر پردی (صِراط) و ئـەو کارانـەی کە دەبێتە مایەی ڕزگاربوون لێی.

**بەشی سێیەم:** ناڕەحەتی تاریکی سەر پـردی (صِـــراط)و ئـەو کارانـەی کـە دەبنە مایەی ڕوناك کەرەوەی.

**بەشـی چـوارەم:** ئــەو تاوانانــەی کـە خاوەنەکـەی بـە هۆیـەوە دەچـێتە دۆزەخەوە.

لە کۆتاییدا داواکارم لە پەروەردگاری بە تواناو بەبـەزەیی ڕزگارمـان بکـات بە ڕەحم و لێبووردەیی خۆی لە هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییە ترسناکەکانی دوارۆژ، بــە تایبــەتی ناخۆشــی و ناڕەحــەتی ســەر پــردی (صِـــــراط)، آمـــــیـــــن.

## بەشی یەکەم: پێناسەی پردی (صِراط) و ناڕەحەتییەکانی

### باسی یەکەم: پردی (صِراط) چییە؟

**پردی (صِراط)**: ئەو پردەیە کە ڕاخراوەو درێژکراوەتەوە بەسەر پشتی دۆزەخدا، تیژترە لە دەمی شمشێر، باریکترە لە تاڵەموو، خلیسکەو پێی لەسەر هەڵدەخلیسکێ، ڕێگەیەکی زۆر تاریك و سووتێنەرە، بەملاو بەولایەوە کۆمەڵە قولاپ و ڕاکێشەرێکی ئاگرینی پێوە هەڵواسراوە، موسڵمانانی شوێن کەوتووانی ڕاستەقینەی پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) بەسەریا تێدەپەڕن و ڕزگاریان دەبێت.

**ووتراوە**: درێژی ئەو پردە سەخت و ناڕەحەتە پانزە هەزار ساڵە[٢].

جا ئەو موسڵمانانەی کەبەسەریدا دەڕۆن یان بە سەلامەتی ڕزگاریان دەبێت، یان بە ناڕەحەتی و ئێش و ئازارێکی زۆرەوە، یان دەکەونە ناو

---

[٢] پێناسەی پردی (صِراط) لە چەند فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیراوە، تەنها درێژی پردی (صِراط) نەبێت کە فەرموودەکەی "مُعْضَل"ـە.

فەرموودەی "مُعْضَل": ئەو فەرموودەیەیە کە لە سەنەدەکەیدا دوو کەس لەو کەسانەی کە گێڕاویانەتەوە نادیارن بە دوای یەکدا، زانای پایەبەرز الجوزجاني (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: فەرموودەی "مُعْضَل" خراپترە لە فەرموودەی "مُنْقَطِع"، وە فەرموودەی "مُنْقَطِع"یش خراپترە لە فەرموودەی "مُرْسَل"، فەرموودەی "مُرْسَل"یش کاری پێناکرێت و ناکرێتە بەڵگە، بڕوانە: "النُّكَت على إبنِ الصَّلاح" (٢/٥٨١-٥٨٢)، وە "توضيح الأفكار" (١/٣٢٩). واتە: ئەو فەرموودەیەی کە باسی درێژی پردی (صِراط) دەکات، فەرموودەیەکی صەحیح نییەو ناکرێتە بەڵگە، بەڵام لەبەر ئەوەی دانەر هێناویەتی و باسی کردووە منیش دەستکاریم نەکردووە. **وەرگێڕ**.

ئاگری دۆزەخەوە.

هاوەڵی بەڕێز سَلمانِ فارسی (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((... وَيُــوضَعُ الصِّراطُ مِثْلُ حَـدِّ المُوسَــي، فَـــتَقُولُ المَلائِكَةُ: مَن يجوز عَلى هذا؟ فَيَقولُ: مَن شِئْتُ مِنْ خَلقِي، فَيَقُولُونَ: سُبْحانَكَ ما عَبَدْناكَ حَقَّ عِبادَتِكَ))[٣].

واتە:... پاشان پردی (صِراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، ئەوەندە تیـژە بـە وێنەی دەمی موس، فریشتەکان دەڵێن: کێ هەیە بتوانێت بەسـەریدا بـڕوات و تێپەڕێت؟ خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێت: ئەو بەندانەی کە خۆم ویستم لێیە، پاشان فریشتەکان دەڵێن: پاکی و بێ گەردی بـۆ تـۆ ئـەی پـەروەردگار بەڕاسـتی ئێمـە تۆمـان بـە تـەواوی نەپەرسـتووەو عیبـادەتی تـەواومان بـۆ نەکردوویت.

هاوەڵی بـەڕێز أبو سَعيد الخُــدري (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پـێم گەیشتووەو بیستوومە کە پردی (صِراط) باریکترە لە تاڵەموو، وە تیژتـرە لە دەمی شمشێر[٤].

وە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمـان دەگێڕێتـەوە کـە فەرموویـەتی: ((... ثُــمَّ يُؤتَى بالجسرِ فَيُجْعَلُ بَين ظَهري جَهَنَّمَ، قُلنا: يا رَسولَ اللهِ وَما الجِــسرُ؟ قــالَ: مُدحضَةٌ مزلَّة، عَلَيه خَطاطِيفٌ وكَلالِيبٌ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَة، لَها شَوكَةٌ عُقَيفــاء تَكونُ بِنَجْدٍ يُقالُ لَها: السَّعدان ...))[٥].

---

[٣] رواه الحاكم (٤/٥٨٦)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٢٦).

[٤] رواه الإمام مسلم (١٨٣).

[٥] رواه البخاري واللفظ له (٧٤٤٠)، ومسلم (١٨٣).

واتـه: ... پاشـان پـردی (صِــــراط) دەهێنرێـت و لەسـەر پـشتی دۆزەخ دادەنرێت، ووتمان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئـەو پـردە چییەو چۆنە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: پردی (صِراط) ڕێگەیەکە زۆر لووسە پێی لەسەر بەند نابێت بەڵکو هەڵدەخلیسکێت، لەسەر ئەو ڕێگەیە کۆمەڵە قولاپ و ڕاکێشەرێك هەیە، وە دڕکی (عُقَیفاءِ) پێوەیە کە بەلەشیانەوە دەنووسێت و ڕایـان دەکێشێت (ئەو دڕکە ئاسنێکی دەم تیژی چەماوەیە کە شتی پیا هەڵدەواسرێت، وەکـو ئـەو قولاپـەی کـە قەسـابەکان گۆشـتی ئـاژەڵانی پیـا هەڵدەواسـن)، پێـی دەووترێت دڕکی (سَعدان) کە لە وولاّتی نەجد هەیە...).

زانای پایەبەرز شـێخ إبنُ العُثَیمِین (ڕەحمەتی خـوای لێبێت) دەڵێت: لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوەو دەکرێت: ئەویش ئەوەیە: چـۆن دەتوانرێـت بەسـەر ڕێگایەکدا بڕۆیت لە کاتێکدا بەو شێوەیەیە؟

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: کارەکانی دواڕۆژ قیاس ناکرێتـە سـەر کارەکانی دونیا، وە خوای پەروەردگار بەسەر هەموو کارێکدا بـە توانـاو بـە دەسـەڵاتە، بۆیە نازانین چۆن بەسەریا تێدەپەڕن، ئایا هەموویان کۆدەبنەوەو بە یـەکجار بەسەریا تێدەپەڕن؟ یان یـەك یـەك بەسـەریا تێدەپـەڕن، خـوای پـەروەردگار زاناترە [٦].

موسڵمانی خۆشەویـست دەتوانیـت گـەورەیی و فراوانـی پـردی (صِــراط) بێنیتە پێش چاوی خۆت لە کاتێکدا هەموو خەڵکی لەسەرە (جگە لـە هـاوەڵ بڕیاردەران و بێباوەڕان، چونکە ئەوان ناچـنە سـەر پـردی (صِــراط) بـەڵکو

---

[٦] بڕوانە: شرح العقيدة الواسطية لِشَيخِ الإسلام إبنُ تيمية، لمحمد الصالح العثيمين (٢/١٦٠).

یەكسەر بۆ دۆزەخ دەبردرێن)، ئەو كاتەی كە ئاسمانەكان و زەوی دەگۆڕدرێت، هەروەك دایكی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویت: پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴿٤٨﴾ ﴾ (إبراهيم: ٤٨) [٧].

واتە: لەو ڕۆژەدا كە قیامەتە ئاسمانەكان و زەوی دەگۆڕدرێت بۆ ئاسمان و زەوی تر. ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ڕۆژەدا خەڵكی لە كوێن؟ ئەویش فەرمووی: لەسەر پردی (صِراط)ن، لە ڕیوایەتێكی تردا كە ئیمامی التِّرمذي گێڕاوێتیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خەڵكی لەو ڕۆژەدا لە تاریكیدان لەسەر پردی (صِراط).

---

[٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٨/١٨٩)، ومسلم (٢٧٩١)، و الترمذي (٣١٢١)، وابن ماجه (٤٢٧٩)، والدارمي (٢٨٠٩)، وابن حبان (٣٣١)، والحاكم (٢/٤٧٣).

## باسی دووەم:
## تەنگ و چەڵەمەو نارەحەتی سەر پردی (صِراط)

تێپەڕ بوون بەسەر پردی (صِراط)دا یەکێکە لە ناخۆشترین و نارەحەتترین و ترسناکترین قۆناغەکانی دواڕۆژ، ئەگەر لە هەموو نارەحەتییەکان سەختترو ترسناکتر نەبێت، ئەوەندە ترس و بیم و نارەحەتی تێدایە کە بە هیچ شێوەیەك عەقڵ و نەفسی مرۆڤەکان ناتوانێت بەرگەی بگرێت و تەحەمولی بکات، **ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر ئەمە، ئەم چوار شتەیە:**

**یەکەم: لەو شوێن و کاتەدا مرۆڤ هیچ کەسی لە بیر نییە جگە لە نەفسی خۆی:**

دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان باسی دواڕۆژ و ئاگری دۆزەخم کرد، دەستم کرد بە گریان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆچی دەگیرییت؟ منیش ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی دواڕۆژ و ئاگری دۆزەخم کرد و گریام، پاشان ووتم: ئایا ئێوە لە قیامەتدا منداڵ و کەس و کارتان لەبیرە، ئەویش فەرمووی: ((أَمَّا فِي ثَلاثَةِ مَواطِنَ فَلا يَذْكُرُ أحدٌ أحَدَاً: عِندَ المِيزانِ حَتَّى يَعْلَمَ أَيَخِفُّ مِيزانُهُ أو يَثْقُلُ، وَحيثُ الكِتابُ حِينَ يُقالُ: ﴿هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيَهْ﴾ حَتَّى يَعْلَمَ أينَ يَقَعُ كِتابُهُ فِي يَمِينِهِ أم شِمالِهِ أم مِن وَراءِ ظَهْرِهِ، وَعِندَ الصِّراطِ إذا وُضِعَ بَينَ ظَهري جَهَنَّم))[8].

---

[8] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤٤/٢٤)، وأبو داود واللفظ له (٤٧٥٥)، والحاكم (٥٧٨/٤)، وحسن إسناده شعيب الأرناؤوط في "تخريج أحاديث جامع الأصول لابن الأثير" (٤٧٥/١٠)، بەلام شێخ

واتە: فەرمووی: لە سێ کات و شوێندا هیچ کەس کەسی لەبیر نییە: لە کاتی دانانی ترازووداا کەس کەسی لەبیر نییە تا ئەو کەسە نەزانێت ئایا پێوانەی کردەوەکانی سووك دەبێت یان قورس؟ وە لەو کاتەی کیتابی کردەوەکان وەردەگیرێت و دەووترێت: «ئەوە کیتابەکەمە بیخوێننەوە» ئەو کەسە هیچ کەسی لەبیر نییە تا نەزانێت ئایا کیتابەکەی بە دەستی ڕاستی وەردەگرێت یان بەدەستی چەپی یان لە پشتیەوە؟ وە لەو کاتەی کە پردی (صِراط) دادەنرێت لەسەر دۆزەخ بۆ پەڕینەوەی موسڵمانان بەسەریا؟ ئەو سێ کاتە ئەوەندە ترسناکە هیچ کەس ئاگای لەکەس نییە، نە ژن و مێرد، نە براو خوشك، نە دایك و باوك و منداڵەکانیان، نە برادەرو هاوڕێ و خۆشەویستان، نەکاربەدەست و شوێن کەوتووانیان، هیچیان کەسیان لە بیر نییە.

**دووەم: ترسانی فریشتەکان لە ناخۆشی و نارەحەتی پردی (صِراط) لە کاتێکدا لێپرسینەوەیان نییە:**

هاوەڵی بەڕێز سَلمانِ فارسي (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... يُوضَعُ المِيزانُ يَومَ القيامَة، فَلَو وُزِنَ فِيه السَّمواتُ والأرضُ لَوَسعَتْ، فَتَقولُ الملائكَةُ: يا رَبّ لِمَنْ يَزِنُ هذا؟ فَيَقولُ اللهُ: لِمَنْ شِئْتُ مِن خَلقِي، فَتَقولُ الملائكَةُ: سُبْحانَكَ ما عَبَدْناكَ حَقَّ عِبادَتِكَ، وَيُوضَعُ الصِّراطُ مِثلُ حَدِّ الموسي، فَتَقولُ الملائكَةُ: مَن تُجيزُ عَلى هذا؟ فَيَقولُ: مَنْ شِئْتُ مِن

---

ئەلبانی ئەم فەرموودەیەی بە "ضَعیف" داناوە، بڕوانە "ضَعيفُ التَّرغيب وَالتَّرهيب" (٢١٠٨)، وە "سنن أبي داود" (٤/٢٤٠، رقم حديث: (٤٧٥٥).

خَلقي، فَيقولونَ: سُبْحانَكَ ما عَبَدْناكَ حَقَّ عِبادَتِكَ))[٩].

واتە: ... لە دوارۆژدا تـرازوو دادەنرێـت (بـۆ كێـشانی كردەوەكـان)، ئەگـەر ئاسمانەكان و زەوی پـێ بكێـشرێت دەیـان گرێـت و دەیانكێـشێت (ئەوەنـدە گەورەیە)، فریشتەكان دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئەو ترازووە بـۆ كـێ كێشانە دەكات، كێ دەتوانێت پڕی بكات؟ خوای پەروەردگار دەفـەرمووێت: بـۆ ئـەو بەندانەی كە خۆم ویستم لێیە، فریشتەكان دەڵێن: پاكی و بێ گەردی بـۆ تـۆ ئەی پەروەردگار بەڕاستی ئێمە تۆمـان بـە تـەواوی نەپەرسـتووەو عیبـادەتی تەواومان بۆ نەكردوویت، پاشـان پـردی (صِــراط) لەسـەر دۆزەخ دادەنرێـت ئەوەندە تیـژە بـە وێنـەی دەمـی مـوس، فریشتەكان دەڵـێن: كـێ بەسـەریدا دەپەڕێنیتەوە، كێ هەیە بتوانێت بەسـەریدا بپەڕێتـەوە؟ خـوای پـەروەردگار دەفەرمووێت: ئەو بەندانەی كە خۆم ویستم لێیە، پاشان فریشتەكان دەڵێن: پاكی و بێ گەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار بەڕاسـتی ئێمـە تۆمـان بـە تـەواوی نەپەرستووەو عیبادەتی تەواومان نەكردوویت.

**سێیەم: وەستانی پێغەمبەر (ﷺ) لەو شوێنەدا بۆ ئەوەی شەفاعەت بكات:**

هاوەڵی بەڕێز أنَسِ كوڕی مالِك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((سَأَلْتُ النَّبيَّ (ﷺ) أَنْ يَشْفَعَ لِي يَومَ القِيامَة فَقالَ: أنا فاعِلٌ، قالَ: قُلْتُ: يا رَسولَ الله فَأينَ أَطْلُبكَ؟ قالَ: أُطْلُبْنِي أولَّ ما تَطْلُبُني عَلى الصِّراط، قالَ: قُلتُ: فإنْ لَمَ أَلْقكَ على الصِّراطِ؟ قال: فَاطْلُبْني عِندَ المِيزانِ، قُلْتُ: فإنْ لَمَ أَلقكَ عِندَ المِيزان؟ قالَ:

---

[٩] رواه الحاكم (٤/٥٨٦)، وصححه الألباني في "صَحيح التَّرغيب والتَّرهيب" (٣٦٢٦).

فَاطْلُبْني عِندَ الحَوضِ فإنّي لا أُخْطِئُ هذه الثلاث المَواطِنِ))[10].

واته: داوام له پێغەمبەر (ﷺ) کرد که له ڕۆژی دواییدا شەفاعەتم بۆ بکات، ئەویش فەرمووی: بەڵێ شەفاعەتت بۆ دەکەم، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لە کوێ بتبینم تا شەفاعەتم بۆ بکەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە دواما بگەڕێ و هەوڵ بدە بمبینە لەسەر پردی (صِراط)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێت نەگەیشتم و نەتم بینی لەسەر پردی (صِـراط)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەوڵ بدە بمبینە لای ترازوو (لە کاتی کێشانی کردەوەکان)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێت نەگەیشتم و نەتم بینی لای ترازوو؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەوڵ بدە لای حەوزی (کَوثَـر) بمبینە، چونکە من هەرگیز ئەو سێ شوێنە جێ ناهێڵم، بەڵکو بەردەوام لەو شوێنانەم.

دەی موسڵمانی خۆشەویست جوان بیر بکەوەو سەیری هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) بکە، چۆن باوەڕی تەواویان بە ڕۆژی دوایی هەبووە؟ وە باوەڕی تەواویان بە هەموو ئەو کارانە هەبووە کە لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدات، وەکو ئەوەی لە پێش چاویان بوبێت، وە بڕوانە هاوەڵی بەڕێز أَنَـسِ کوڕی مالِك (خوای لێ ڕازی بێت) چۆن مەوعیدی بۆ دانراوە، وە چۆن شوێنی بۆ دیاری کراوە تا شەفاعەتی بۆ بکرێت، ئەمەش هەمووی بە هۆی باوەڕی تەواویان و ترسیان لەو ڕۆژە بووە، سەد خۆزگە ئێمەش وەکو ئەوان بوینایە.

---

[10] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٣٢/٢٤)، والترمذي (٢٤٣٣)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٢٥).

**چوارەم: لەو کات و شوێنەدا هیچ کەس ناتوانێت قسە بکات تەنها پێغەمبەران نەبێت** (صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت):

وە ئەوەی ترسناکی پردی (صِراط) دەربخات ئەوەیە لەو شوێنەدا هیچ کەس ناتوانێت لە کاتی پەڕینەوەدا قسە بکات، جگە لە پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) کە داوا لە خوای پەروەردگار دەکەن تا شوێن کەوتوانیان بە ساغ و سەلامەتی بیپەڕێنێتەوەو ڕزگاریان بکات، هەروەك هاوەڵی بەڕێز أبو هُريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((... فَيُضْرَبُ الصِّراطُ بَينَ ظَهرانَي جَهَنَّمَ، فأكونُ أوَّلُ مَن يجوز مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّتِه، وَلا يَتَكَلَّمُ يَومَئذٍ إلا الرُّسُلُ، وَكَلامُ الرُّسُلِ يَومَئذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ ...))[١١].

واتە: ... پاشان پردی (صِـــراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، من یەکەم پێغەمبەر (ﷺ) دەبم کە ئوممەتەکەمی بەسەردا دەپەڕێنمەوە، وە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس ناتوانێت قسە بکات تەنها پێغەمبەران نەبێت (صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت)، وە ووتەو پاڕانەوەی پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) لەو ڕۆژەدا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە...).

موسڵمانی خۆشەویست لەو فەرموودانەی سەرەوە کە باسمان کرد ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە تێپەڕین بەسەر پردی (صِراط)دا یەکێکە لە ترسناکترین قۆناغەکانی دواڕۆژ، ئەو نارەحەتییەش وا پێویست دەکات لەسەرمان کە

---

[١١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٣٢/٢٤)، والترمذي (٢٤٣٣)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٢٥).

سوور بین و هەوڵ بدەین کاری چاکە زۆر بکەین و خۆمان لە خراپەو تاوان بپارێزین تا ڕزگارمان بێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط).

هەر بۆیە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) مُعاذِ کوڕی جَبَل (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((إنَّ المُؤمِنَ لا يَسكُنُ رَوعُهُ حَتَّى يَترُكَ جِسْرَ جَهَنَّمَ وَراءَهُ))[12].

واتە: ئیماندار دڵی ئارام نابێت و ترسی لەسەر لاناچێت تا بەسەر پردی (صِراط)دا نەپەڕێتەوەو دۆزەخ نەکەوێتە پشتییەوە.

وە هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((آخِرُ مَن يَدخُلُ الجَنَّةَ رَجُلٌ يَمشي عَلى الصِّراطِ، فَهُو يَمشي مَرَّةً وَيَكبُو مَرَّةً وَتَسفعُهُ النَّارُ مَرَّةً، فإذا جَاوَزَها التَفَتَ إلَيها فقالَ: تَبارَكَ الذّي نَجاني مِنكَ؛ لَقَد أعطانِي اللهُ شَيئاً مَا أعْطاهُ أحَدَاً مِنَ الأوَّلينَ وَالآخِرينَ ...))[13].

واتە: کۆتا کەس کە دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە کاتێك بەسەر پردی (صراط)دا دەڕوات، جارێك ئاسایی دەڕوات و جارێك بەدەمدا دەکەوێت و جارێك هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و ئازاری دەدات، کاتێك تێپەڕی بەسەریداو ڕزگاری بوو لێی، ئاوڕێك دەداتەوەو سەیرێکی دۆزەخ دەکات و دەڵێت: بەخششی زۆرە ئەو پەروەردگارەی کە منی ڕزگار کرد لە

---

[12] **بڕوانە**: موعظة المؤمنين من إحياء علوم الدين للقاسمي (ص٤٣١).
[13] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني"(١٧٥/٢٤)، والبخاري (٦٥٧١)، ومسلم واللفظ له (١٨٧).

تــۆ، بەڕاستی خوای پەروەردگار شتێکی بە من بەخشیوە (ڕزگاری کـردم لـە ئاگری دۆزەخ) بە هیچ شێوەیەك بە کەسی نەبەخشیوە نە لە پێشینان و نـە لە کۆتاییان...).

## باسی سێیەم:
## ئایا بێباوەڕان و دووڕووەکان بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن؟

هەندێ لە زانایان بۆچوونیان وایە کە خەڵکی هەموویان (موسڵمانان و بێباوەڕان) بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن، بەڵام فەرموودەی (صَحیح) لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە هاوەڵ بڕیاردەران و گاورو جولەکە بەسەر پردی (صِراط)دا ناڕۆن [١٤]، لەبەر ئەوەی پێش دانانی پردی (صِراط) فەرمانیان پێ دەکرێت تا شوێنی ئەو شتە بکەون کە لە دونیادا پەرستوویانە، ئەوانیش شوێنی پەرستراوەکانیان دەکەون و بانگێکیان لێ دەکرێت و دەکەونە ناو دۆزەخەوە، پاشان موسڵمانانی ئەم ئوممەتە لە ناخۆشی و ناڕەحەتی ساحەی مەحشەردا دەمێننەوە، پاشان پردی (صِراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت.

هاوەڵی بەڕێز أبو سَعيد الخُدري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّه هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ إِذَا كَانَتْ صَحْوًا؟ قُلْنَا: لاَ. قَالَ: فَإِنَّكُمْ لاَ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذ، إِلاَّ كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا، ثُمَّ قَالَ: يُنَادِي مُنَادٍ لِيَذْهَبْ كُلُّ قَوْمٍ إِلَى مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. فَيَذْهَبُ أَصْحَابُ الصَّلِيبِ مَعَ صَلِيبِهِمْ، وَأَصْحَابُ الأَوْثَانِ مَعَ أَوْثَانِهِمْ، وَأَصْحَابُ كُلِّ آلِهَةٍ مَعَ آلِهَتِهِمْ، حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ وَغُبَّرَاتٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، ثُمَّ يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ تُعْرَضُ كَأَنَّهَا سَرَابٌ، فَيُقَالُ:

---

[١٤] رواه البخاري واللفظ له (٧٤٤٠)، ومسلم (١٨٣).

لِلْيَهُودِ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّه. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ لَمْ يَكُنْ لِلَّه صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ قَالُوا: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا، فَيُقَالُ: إشْرَبُوا، فَيَتَسَاقَطُونَ فِي جَهَنَّمَ، ثُمَّ يُقَالُ: لِلنَّصَارَى مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّه. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ لَمْ يَكُنْ لِلَّه صَاحِبَةٌ وَلاَ وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا. فَيُقَالُ: اشْرَبُوا. فَيَتَسَاقَطُونَ فِي جَهَنَّمَ، حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ، فَيُقَالُ: لَهُمْ مَا يَحْبِسُكُمْ وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ؟ فَيَقُولُونَ: فَارَقْنَاهُمْ وَنَحْنُ أَحْوَجُ مِنَّا إِلَيْهِ الْيَوْمَ وَإِنَّا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. وَإِنَّمَا نَنْتَظِرُ رَبَّنَا، قَالَ: فَيَأْتِيهِمُ الْجَبَّارُ. فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا. فَلاَ يُكَلِّمُهُ إِلاَّ الأَنْبِيَاءُ، فَيَقُولُ: هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ تَعْرِفُونَهُ، فَيَقُولُونَ: السَّاقُ. فَيَكْشِفُ عَنْ سَاقِه فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّه رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ كَيْمَا يَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا، ثُمَّ يُؤْتَى بِالْجَسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّه وَمَا الْجَسْرُ؟ قَالَ: مَدْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ، عَلَيْه خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ، لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ تَكُونُ بِنَجْدٍ، يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ، الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا ...))[١٥].

واته: ووتمان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا ئێمە خوای پەروەردگار دەبینین لە دواڕۆژدا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا ئێوە تووشی هیچ ناڕەحەتی و زەحمەتێك دەبن لە كاتی سەیركردنی خۆرو مانگ لە ڕۆژێكی ساف و بێ تەم

[١٥] رواه البخاري واللفظ له (٧٤٤٠)، ومسلم (١٨٣).

و هـەوردا؟ ووتمـان: نـەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: دەی کـەوابوو ئێـوە تووشــی هــیچ ناڕەحــەتی و زەحمــەتێك تــابن لــە کــاتی بینینــی خــوای پەروەردگاردا هـەروەك چۆن تووشـی ناڕەحـەتی و زەحمـەت نـابن لـە کـاتی سەیر کردنـی خـۆرو مـانگ لـە ڕۆژێکـی سـاف و بـێ تـەم و هـەوردا، پاشـان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لە ڕۆژی دواییدا بانگ کەرێك بانگ دەکات با هەموو گەلێك بڕوات بۆ لای ئەوەی کە لە دونیادا پەرستوویەتی و شوێنی بکەوێت، کەسانی خاوەن سەلیب (گاورەکان) لە گەڵ سەلیبەکانیان و بت پەرستەکان لەگـەڵ بتـەکانیان دەڕۆن بـۆ نـاو ئـاگری دۆزەخ، ئـەوەی کـە دەمێنێتـەوە ئەوانەن کە خـوای پـەروەردگاریان پەرستووە لـە چاکەکاران و تاوانبـاران و پاشماوەی گاورو جولەکە (واتە: لەسەر دینـی خۆیـان مـابوون، بـەڵام کاتێـك ئیسلام هات پێیان نەگەیشتبوو)، پاشان دۆزەخ دەهێنرێت و دەخرێتە پـێش چاو بە وێنەی (سَــراب) *، بـە جولەکـە دەووترێت: چیتان پەرستووە لـە دونیادا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لە دونیادا عوزەیری کوڕی خوامان پەرستووە (عليه السلام)، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد، چونکە خـوای پـەروەردگار خێـزان و کوڕی نییە، ئێستا چیتان دەوێت و داوای چـی دەکـەن؟ ئـەوانیش دەڵـێن: دەمانــەوێت ئـاو بخۆینــەوە (گــەرمای خــۆر زۆر تینــووی کــردوون)، پێیــان دەووترێــت: بــڕۆن ئــاو بخۆنــەوە، کاتێــك دەڕۆن بەردەبنــەوە نــاو ئــاگری دۆزەخـەوە، پاشـان بـە گـاور دەووترێـت: ئـەی ئێـوە چیتان پەرستووە لـە

* السَّراب: بەو شتە دەووترێت: کاتێك لە گەرمای هاویندا سەیری دەشتاییەك یان سەیری سەر جادەیەکی قیر دەکەیت شتێك دەردەکەوێت وەکو ئاو وایە، بەڵام ئاو نییە، بەڵکو گەرمای خۆرەیەکە ڕەمل دەکات بە وێنەی ئاو.

دونیادا؟ ئـەوانیش دەڵـێن: ئێمـە لـە دونیـادا عیـسای کـوڕی خوامـان (ﷺ) پەرستووە، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد، چونکە خوای پەروەردگار خێزان و کـوڕی نییـە، دەی کـەوابوو ئێـستا چـیتان دەوێـت و داوای چـی دەکـەن؟ ئەوانیش دەڵـێن: دەمانـەوێت ئـاو بخۆینـە، دەووترێـت: بـڕۆن ئـاو بخۆنـەوە، کاتێك دەڕۆن بەردەبنەوە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە، ئەمانـە هـەر لەسـەرەتاوە دەچنە ناو دۆزەخەوە، ئەوەی کە دەمینێتـەوە ئـەو موسـڵمانانەن کـە خـوای پەروەردگاریان پەرستووە لـە چاکەکاران و خراپـەکاران، پێیـان دەووترێـت: چی ڕێگری لێکردن تا نەڕۆن لە کاتێکدا خـەڵکی ڕۆیـشتن؟ ئـەوانیش دەڵـێن: ئێمە لە دونیاشدا لـە خۆیـان و پەرستراوەکانیان جیـا ببووینـەوە، وە ئێمـە ئەمڕۆ زیاتر پێویستمان بە خـوای پـەروەردگارە، وە ئێمـە گوێمـان لـە بـانگ کەرێك بوو بانگی کردوو ووتی: با هەموو گەلێك بڕوات بـۆ لای ئـەوەی کـە لـە دونیادا پەرستوویەتی و شوێنی بکەوێت، ئێمەش چاوەڕێی خوای پەروەردگار دەکـەین، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: پاشـان خـوای پـەروەردگار دێـت بـە شێوەیەك جیاتر لەو شێوەیەی کە یەکەم جار بینیبویـان، دەفـەرموێت: مـن پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ تۆ پەروەردگاری ئێمـەیت، بۆیـە لەو ڕۆژەدا هـیچ کـەس قـسە ناکـاو داوا لـە خـوای پـەروەردگار ناکـات تـەنها پێغەمبەران نەبێت (صەڵات و سەلامی خوایـان لەسـەر بێت)، خـوای پـەروەردگار دەفەرموێت: ئایا لە نێوان ئێوەو خـوای پـەروەردگاردا نیـشانەیەك هەیـە تـا پێی بناسنەوە؟ ئـەوانیش دەڵـێن: بـەڵێ بـە (سـاقی) دەیناسـینەوە، کاتێـك (سـاقی) هەڵدەداتـەوە هـەموو ئیمانـدارێك سـوجدەی بـۆ دەبـات، بـەڵام ئـەو کەسانەی لە دونیادا سوجدەیان بۆ خوا بردووە بەڵام بـۆ ڕیـاو نـاو دەرکـردن

بووه (دووڕووەکان)، دەیانەوێت وەکو ئیمانداران سوجدە بەرن بۆ خوای پەروەردگار، بەڵام پشتیان ڕەق دەبێت ناتوانن سوجدەی بۆ بەرن، پاشان پردی (صِراط) دەهێنرێت و لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، ووتمان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پردە چییە و چۆنە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پردی (صِــراط) ڕێگەیەکە زۆر لووسە پێی لەسەر بەند نابێت بەڵکو هەڵدەخلیسکێت، لەسەر ئەو ڕێگەیە کۆمەڵە قولاپ و ڕاکێشەرێك هەیە، وە درکی (عُقَیفاءِ) پێوەیە کە بەلەشیانەوە دەنوسێت و ڕایان دەکێشێت، پێی دەووترێت (سَعدان) کە لە وولاتی نەجد هەیە، ئیمانداران بەسەریا دەپەڕنەوە هەیانە وەکو: چاو تروکان دەپەڕێتەوە، وە هەیانە وەکو: شەوقی ئاوێنە دەپەڕێتەوە، هەیانە وەکو: با دەپەڕێتەوە، هەیانە وەکو: سوارچاکێك دەپەڕێتەوە، هەیانە بە پیادە دەپەڕێتەوە، بۆیە ئەوانەی کە بەسەریا ئەڕۆن هەیانە بەسەلامەتی ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە ڕزگاری دەبێت بەڵام لەش و دەم و چاوی ڕووشاوە، هەیانە بەردەبێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ و ناتوانێت بپەڕێتەوە، هەتا کۆتا کەسیان ڕزگاری دەبێت کەسێکە دەکەوێت و هەڵدەستێتەوە و ڕادەکێشرێت، بەو حاڵە ناخۆشە بەڵام ڕزگاری دەبێت...).

لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی مُسْلِم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) گێڕاویێتیەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ لِيَتَّبِعْ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ. فَلاَ يَبْقَى أَحَدٌ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللَّهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الأَصْنَامِ وَالأَنْصَابِ إِلاَّ يَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ وَفَاجِرٍ وَغُبَّرِ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَيُدْعَى الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلاَ وَلَدٍ، فَمَاذَا تَبْغُونَ؟ قَالُوا:

عَطِشْنَا يَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا. فَيُشَارُ إِلَيْهِمْ أَلاَ تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى النَّارِ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ. ثُمَّ يُدْعَى النَّصَارَى، فَيُقَالُ: لَهُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ لَهُمْ: كَذَبْتُمْ. مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلاَ وَلَدٍ. فَيُقَالُ لَهُمْ: مَاذَا تَبْغُونَ؟ فَيَقُولُونَ: عَطِشْنَا يَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا. قَالَ: فَيُشَارُ إِلَيْهِمْ أَلاَ تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ تَعَالَى مِنْ بَرٍّ وَفَاجِرٍ، أَتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فِي أَدْنَى صُورَةٍ مِنَ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا. قَالَ: فَمَا تَنْتَظِرُونَ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ؟. قَالُوا: يَا رَبَّنَا فَارَقْنَا النَّاسَ فِي الدُّنْيَا أَفْقَرَ مَا كُنَّا إِلَيْهِمْ وَلَمْ نُصَاحِبْهُمْ. فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ لاَ نُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا "مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا" حَتَّى إِنَّ بَعْضَهُمْ لَيَكَادُ أَنْ يَنْقَلِبَ. فَيَقُولُ: هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ فَتَعْرِفُونَهُ بِهَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ. فَيُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ فَلاَ يَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِهِ إِلاَّ أَذِنَ اللَّهُ لَهُ بِالسُّجُودِ، وَلاَ يَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ اتِّقَاءً وَرِيَاءً إِلاَّ جَعَلَ اللَّهُ ظَهْرَهُ طَبَقَةً وَاحِدَةً كُلَّمَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ خَرَّ عَلَى قَفَاهُ. ثُمَّ يَرْفَعُونَ رُءُوسَهُمْ وَقَدْ تَحَوَّلَ فِي صُورَتِهِ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ، فَقَالَ: أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا. ثُمَّ يُضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، وَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ ...)) [١٦].

واته: كاتێك ڕۆژی قیامەت دێت بانگکەرێك بانگ دەكات با هەموو گەلێك بڕوات بۆ لای ئەوەی كە لە دونیادا پەرستوویەتی، ئەوانەی جگە لە خوای پەروەردگار بت و داروو بەردیان پەرستووە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە،

---

[١٦] رواه مسلم (٢/٦٦/٤٧٢).

تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خوای پەروەردگاریان پەرستووە لە چاکەکاران و تاوانباران و پاشماوەی گاورو جولەکە، بانگی جولەکە دەکرێت و پێیان دەووترێت: چیتان پەرستووە لە دونیادا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لە دونیادا عوزەیری کوڕی خوامان پەرستووە، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد، چونکە خوای پەروەردگار نە خێزانی هەبووەو نە کوڕیش، ئێستا چیتان دەوێت و داوای چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: تینومانە دەمانەوێت ئاو بخۆینەوە، ئاماژەیان بۆ دەکرێت و پێیان دەووترێت بۆ ناڕۆن بۆسەری؟ پێش دەخرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ کە بە وێنەی (سَــــراب)ــە، هەندێکی هەندێکی تێك دەشکێنێت، کاتێك دەڕۆن بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخەوەو دەکەونە ناوی، پاشان بانگی گاورەکان دەکرێت و پێیان دەووترێت: ئەی ئێوە چیتان پەرستووە لە دونیادا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لە دونیادا عیسای کوڕی خوامان پەرستووە، پێیان دەووترێت: درۆتان کرد، چونکە خوای پەروەردگار نە خێزانی هەبووەو نە کوڕیش، ئێستا چیتان دەوێت و داوای چی دەکەن؟ ئەوانیش دەڵێن: تینومانە دەمانەوێت ئاو بخۆینەوە، ئاماژەیان بۆ دەکرێت و پێیان دەوترێت بۆ ناڕۆن بۆسەری؟ پێش دەخرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ کە بە وێنەی (سَــــراب)ــە، هەندێکی هەندێکی تێك دەشکێنێت، کاتێك دەڕۆن بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخەوەو دەکەونە ناوی، ئەوان دەڕۆن کەس نامێنێتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە خوای پەروەردگاریان پەرستووە لە چاکەکاران و خراپەکاران و پاشماوەی گاورو جولەکە، لەو کاتەدا خوای پەروەردگار دێت بۆ لایان (هاتنێك کە شایستەیە بە خۆی) بە نزیکترین شێوە کە دونیادا ناسیویانە (موسڵمانان خوایان نەبینیوە لە دونیادا بەڵام

ناسیویانە بە ناوو سیفاتەکانی کە هیچ کەس و شتێك لەو ناچێت)، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: چاوەڕێی چی دەکەن؟ هەموو ئوممەتێك شوێنی ئەوە کەوتن کە لە دونیادا پەرستبوویان، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئێمە لە دونیادا لە خەڵکی جیابوینەوە و هاوەڵایەتیمان نەکردن لە کاتێکدا زۆر پێویستمان پێیان بوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: پەنا دەگرین بەتۆ ئەی خوای پەروەردگار بە هیچ شێوەیەك هاوەڵمان بۆت بڕیارنەداوەو بڕیاریشی نادەین (دوو جار یان سێ جار وا دەڵێن)، هەتا هەندێ لە موسڵمانان لەوکاتەدا خەریکە پەشیمان دەبنەوە لە بیروباوەڕی پاکیان لە بەر گرانی و سەختی ئەو تاقی کردنەوەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ئایا هیچ نیشانەیەك هەیە لە نێوان ئێوەو ئەودا تا پێی بناسنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، لەو کاتەدا پەردە لەسەر (ساق)ی لادەدرێت، هیچ کەس نییە لە دونیادا کە بە دڵسۆزی و ئیخلاصەوە سوجدەی بۆ خوا بردبێت ئیللا خوای پەروەردگار ڕێگەی پێدەدات تا سوجدەی بۆ بەرێت، وە هیچ کەس نییە لە دونیادا سوجدەی بۆ ڕیاو ناو دەرکردن بردووە، ئیللا خوای پەروەردگار پشتی دەکات بە یەك پارچە هەر کاتێك بیەوێت سوجدەی بۆ بەرێت بە پشتا دەکەوێت، پاشان موسڵمانان سەریان بەرز دەکەنەوە خوای پەروەردگار دەبینن لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە دونیادا ناسیویانە (بە ناوو سیفاتەکانی کە هیچ کەس و شتێك لەو ناچێت)، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، ئەوانیش دەڵێن: بەڵی تۆ پەروەردگاری ئێمەیت، پاشان پردی (صراط) بەسەر دۆزەخەوە دادەنرێت، ڕێگە بە شەفاعەت

## باسی چوارەم:
## حاڵی خەڵکی لەسەر پردی (صراط)

ئەو خەڵکەی بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن بە چوار شێوە دەپەڕنەوە، هەریەك بە پێی ئەو ئیمانەی کە هەیبووە، وە بە ئەندازەی ئەو کردەوەیەی کە لە دونیادا کردوویەتی، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە هاوەڵی بەڕێز أبو سَعيد الخُدري (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَى جَهَنَّمَ عَلَيْهِ حَسَكٌ كَحَسَكِ السَّعْدَانِ ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَمَخدُوجٌ بِهِ "أي مَخْدوش"، ثُمَّ نَاجٍ وَمُحْتَبِسٌ بِـهِ، وَمَنْكُوسٌ فِيهَا ...))[19].

واتە: پردی (صِراط) دادەنرێت لەسەر پشتی دۆزەخ، دڕكێكی لەسەرە وەکو دڕکی (سَعْدان)ـە، پاشان خەڵکی دەکەونە ڕێ تا بەسەریا بپەڕنەوە، هەیانە بە سەلامەتی دەپەڕێتەوەو ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە لاشەی هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و لاشەی بریندار دەبێت و دەڕوشێت، بەڵام ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە ڕادەگیرێت، وە هەیانە سەرەوخوار دەکرێت و بەسەرسەرا بەردەدرێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ...).

---

(١٩) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٥٧/٢٤)، وابن ماجه (٤٢٨٠)، وابن حبان (٧٤٢٩)، والحاكم (٦٢٨/٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٨١٨٩).

**لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆیشتنی خەڵکی بەسەر پردی (صِراط)دا بەم شێوانەیە:**

**یەکەم:** خەڵکی وا هەیە لەسەر پردی (صِراط) زۆر بە خێرایی دەپەڕێتەوەو ڕزگاری ئەبێت، نە هەڵاوی گەرمی دۆزەخ و نە قولاپەکانی پردی (صِراط) نایگرێت، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی مَسعُود (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ منها بأعمالهم، فأوَّلُهُم كَلَمْحِ البرقِ ثُمَّ كَالرِّيحِ ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ "أي كَجَري الفَرَسِ" ثُمَّ كَالرّاكِبِ فِي رِحْلِهِ ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ ثُمَّ كَمَشْيِه)) [٢٠].

واتە: خەڵکی دێنە دیار ئاگری دۆزەخ، پاشان بە پێی کردەوەکانیان بەسەر پردی (صِراط)دا تێدەپەڕن و ڕزگاریان دەبێت لێی، یەکەم کەس و کۆمەڵیانیان بە وێنەی تیشك دەپەڕێتەوە، پاشان وەکو با، پاشان وەکو ڕۆیشتنی سوارچاکێك، پاشان وەکو سوارییەکی ئاسایی، پاشان وەکو ڕۆیشتنی پیاوێکی باش، پاشان وەکو ڕۆیشتنی پیاوێکی سادەو ئاسایی.

**دووەم:** هەیانە قولاپەکانی ئەملاو ئەولای پردی (صِراط) دەیگرێت و لاشەی بریندار دەکات و دەیروشێنێت، یان گۆشتی لاشەی دەپچڕێت، پاشان ڕزگاری دەبێت، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) حُذیفة (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)

---

[٢٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٠٩/١٨)، والترمذي (٣١٥٩)، والدارمي (٢٨١٠)، والحاكم (٥٨٦/٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترمذي" (٢٥٢٦).

فەرموویەتی: ((... وَفِي حَافَتِي الصِّرَاطِ كَلالِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ تَأْخُذُ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ، فَنَاجٍ مَخْدُوشٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي النَّارِ...)) [٢١].

واتە: ... بەملاو بەولای پردی (صـــراط)ـەوە قولاپی ئاسنی پیا هەڵواسراوە، فەرمانی پێکراوە ئەوانە ڕابکێشێت کە دۆزەخین و فەرمانی ڕاکێشانیان کراوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، هەیانە لاشەی هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و بریندار دەبێت و دەڕوشێت و پاشان ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە بە پشتا بەردەدرێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ.

وە هەروەها هاوەڵی بەڕێز أبوهُرَيرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((... وَفِي جَهَنَّمَ كَلالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ؟. قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو، ...)) [٢٢].

واتە: ... لە دۆزەخدا قولاپ هەیە بە وێنەی دڕکی (سَعدان)ـە، ئایا دڕکی (سَـــعدان)تـان بینیـوە؟ فـەرموویان: بـەڵێ، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: قولاپەکانی ناو دۆزەخ بە وێنـەی دڕکـی (سَـــعدان)ــە، بـەڵام هـیچ کـەس گەورەیی ئەو دڕکە نازانێت جگە لـە خـوای پـەروەردگار، ئـەو دڕکـە (لـە نـاو دۆزەخدا ئاسنە) خەڵکی ڕادەکێشێت بۆ نـاو ئـاگر بـە پێـی کردەوەکانیـان،

---

[٢١] رواه الإمام مسلم (١٩٥)، والحاكم (٤/٦٣١).

[٢٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٥٧)، والبخاري (٨٠٦)، ومسلم (١٨٢)، وابن ماجه (٤٢٨٠).

هەیانە لە ناو دەچێت، سزاو ئێش و ئازار زۆر دەبینێت بە هۆی کردەوە خراپەکانییەوە، وە هەیانە قولاپەکانی تەنیشت پردی (صِراط) ڕایدەکێشێت و گۆشتی لاشەی پارچە پارچە دەکات، بەڵام لە دواییدا ڕزگاری دەبێت.

زانای پایەبەرز إبنُ الحَجَر لە الزَّينُ إبْنُ المُنير (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە حیکمەت لە شوبهاندنی قولاپەکانی ناو دۆزەخ بە دڕکی (سَعدان) ئەوەیە: ئەو دڕکە زۆر زوو مرۆڤەکان ڕادەکێشێت و زوو بەلاشەیانەوە دەنووسێت، وە بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) قولاپەکانی تەنیشت پردی (صِراط)ی شوبهاندووە بەو دڕکە چونکە لە دونیادا بینیویانە [٢٣].

هەیانە لەسەر پردی (صِراط) ڕادەگیرێت و تووشی ئێش و ئازارو ناڕەحەتییەکی زۆر دەبێت، وە تووشی ترس و سزایەکی وا دەبێت کە دڵەکان دێنێتە لەرزین، هەروەك هاوەڵی بەڕێز سَهلِ کوڕی مُعاذِ کوڕی أَنَسِ الجُهَني لە باوکیەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)گێڕاویێتیەوە کە فەرموویەتی: ((... وَمَنْ رَمى مُسْلِمًا بِشَيْءٍ يُرِيدُ شَيْنَهُ بِهِ، حَبَسَهُ اللَّهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ)) [٢٤].

واتە: ... هەرکەسێك شتێك لە عەیبە و کەم و کوڕی بداتە پاڵ موسڵمانێك و مەبەستی پێی ناشرین کردن و شکاندنەوەی بێت، ئەوە خوای پەروەردگار

---

[٢٣] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري لإبن حجر العسقلاني (٤٦٢/١١ ح ٦٥٧٤).

[٢٤] أخرجه الأمام أحمد (٤٤١/٣، رقم ١٥٦٨٧)، وابن المبارك (٢٣٩/١، رقم ٦٨٦)، وأبو داود (٢٧٠/٤، رقم ٤٨٨٣)، وابن أبي الدنيا (ص ١٥١، رقم ٢٤٨)، والطبراني (١٩٤/٢٠، رقم ٤٣٣)، وأخرجه أيضًا: البخاري في "التاريخ الكبير" (٣٧٧/١)، وحسنه الألباني في "صحيح أبي داود" (٤٠٨٦).

لەسەر پردی (صِراط) ڕایدەگرێت تا پاك دەبێتەوە لەو تاوانە، ئەویش یان بەڕازی کردنی ئەو کەسەیە کە خراپەو عەیبەی داوەت پاڵ، یان بە هۆی شەفاعەتەوەیە، یان دەبێت ئەو کەسە بە ئەندازەی تاوانەکەی سزای دۆزەخ بکێشێت[٢٥].

**سێیەم:** هەیانە بە هۆی کردەوە خراپەکانییەوە لە ناو دەچێت و دەکەوێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە (پەنا بە خوای پەروەردگار) لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە هاوەڵی بەڕێز أبو بَكْرَة (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يُحْمَلُ النَّاسُ عَلى الصِّراطِ يَومَ القيامَةِ، فَتَقَادَعُ بِهِم جَنَبَةُ الصِّراطِ، تَقَادُعَ الْفَرَاشِ في النَّارِ، قالَ: فَيُنَجِّي اللهُ تَبارَكَ وَتَعالَى بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشاءُ))[٢٦].

واتە: لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی دەهێنرێنە سەر پردی (صِراط)، قولاپەکانی تەنیشت پردی (صِراط) (ڕایان دەکێشێت و یەك لە دوای یەك بەریان دەداتەوە ناو ئاگری دۆزەخ، بە وێنەی کەوتن و بەربونەوەی پەپولە بۆ ناو ئاگر (چەند ناسکە و چەند زوو دەسووتێت کاتێك لە ئاگر نزیك دەبێتەوە)، پاشان خوای پەروەردگار ئەو کەسانە ڕزگار دەکات کە خۆی ویستی لێیە.

موسڵمانی خۆشەویست لەو کات و ساتە ترسناك و سەختەدا کە دڵەکان دێنە لەرزین، پێغەمبەران (سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) دەست دەکەن بە پاڕانەوەو بەردەوام دەڵێن: اللّهُمَّ سَلِّم سَلِّم، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان

---

[٢٥] بڕوانە: عون المعبود شرح سنن أبي داود (١٠/٤٠٧/حديث ٤٢٣٩).

[٢٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٥٦)، وحسنه الألباني في "ظلال الجنة" (٨٣٧).

بکە، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، زۆر پەرۆشن و بەزەییان بە حاڵی ئەو خەڵکەدا دێتەوە کاتێك دەیان بینن لەسەر پردی (صِراط).

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... فَـيُضْرَبُ الصِّراطُ بَينَ ظَهرانَي جَهَنَّم، فَأكونُ أَوَّلَ مَنْ يجوزُ مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّته، وَلا يَتَكَلَّمُ يَومَئِذٍ إلاّ الرُّسُلُ، وَكَلامُ الرُّسُلِ يَومَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، وَفِي جَهَنَّمَ كَلاليبَ مِثْلُ شَوكِ السَّعدانِ، لا يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِها إلا الله، تَخْطَفُ النّاسُ بِأعمالِهِم، فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ "أي يُهْلِكُ"، وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ، ثُمَّ يَنْجُو ...)) [٢٧].

واتە: ... پاشان پردی (صِراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، من یەکەم پێغەمبەر (ﷺ) دەبم کە ئوممەتەکەمی بەسەردا دەپەڕێنمەوە، وە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس ناتوانێت قسە بکات تەنها پێغەمبەران نەبێت (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت)، وە ووتەو پاڕانەوەی پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) لەو ڕۆژەدا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، لە دۆزەخدا قولاپ هەیە بە وێنەی دڕکی (سَعدان)، هیچ کەس گەورەیی ئەو دڕکە نازانێت جگە لە خوای پەروەردگار، ئەو دڕکە خەڵکی ڕادەکێشێت بۆ ناو ئاگر بە پێی کردەوەکانیان، هەیانە لە ناو دەچێت و سزاو ئێش و ئازار زۆر دەبینێت بە هۆی کردەوە خراپەکانییەوە، وە هەیانە قولاپەکانی دۆزەخ ڕایدەکێشێت و

---

[٢٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٥٧)، والبخاري واللفظ له (٨٠٦)، ومسلم (١٨٢)، وابن ماجه (٤٢٨٠).

گۆشتی لاشەی پارچە پارچە دەکات، پاشان ڕزگاری دەبێت و دەردەچێت.

## سەرەتاو کۆتا کەس کە بەسەر پردی (صِراط)دا تێدەپەڕێت

یەکەم ئوممەت لە ئوممەتان کە بەسەر پردی (صِراط)دا تێدەپەڕێت ئوممەتی پێغەمبەری خۆمانە (ﷺ)، ئەویش لەبەر ڕێزێتی لای خوای پەروەردگار، هاوەڵی بەڕێز أبو هُريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... فَيُضرَبُ الصِّراطُ بَينَ ظَهراني جَهَنَّمَ، فأكونُ أوَّلُ مَن يجوز مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّتِه، ...)) [٢٨].

واتە: ... پاشان پردی (صِراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، من یەکەم پێغەمبەر (ﷺ) دەبم کە ئوممەتەکەمی بەسەردا دەپەڕێنمەوە.

وە یەکەم کەسیش لەم ئوممەتە کە بەسەر پردی (صِراط)دا دەپەڕێتەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە هاوەڵی بەڕێز أبو سَعيد الخُدري (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... وَالأنبياءُ بِجَنْبَتَي الصِّراطِ، وَأَكْثَرُ قَولِهِم: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، فَأكونُ أنا وَأُمَّتي أوَّلَ مَنْ يَمُرُّ، أَو قالَ: أَوَّلُ مَنْ يُجيزُ،...)) [٢٩].

---

[٢٨] رواه الإمام أحمد "لفتح الرباني" (١٥٧/٢٤)، والبخاري واللفظ له (٨٠٦)، ومسلم (١٨٢)، وإبن ماجه (٤٢٨٠).

[٢٩] رواه ابن أبي عاصم في "السنة" (٢٨٤/١)، وقال الألباني في "ظلال الجنة": إسناده جيد وهو على شرط

واتە: ... لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) لە تەنیشت پردی (صِراط)ەوە دەوەستن و لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە تا شوێن کەوتوانیان بەسەلامەتی بپەڕنەوەو ڕزگاریان بێت، زۆربەی پاڕانەوەو ووتەیان لەو ڕۆژەدا ئەوەیە کە دەڵێن: ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، من و شوێن کەوتوانم یەکەم کەس و کۆمەڵین کە بەسەریا دەڕۆین، یان فەرمووی: ئێمە یەکەم کەس و کۆمەڵین کە بەسەریا تێدەپەڕین.

وە یەکەم کۆمەڵ دوای پێغەمبەر (ﷺ) لەم ئوممەتە کە بەسەر پردی (صِراط)دا تێدەپەڕن، موسڵمانە هەژارە کۆچکردووەکانن (واتە: پێش هەموو موسڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەك هاوەڵی بەڕێزو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) ثـوبان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((أنَّ حَبْرَاً منْ أحبارِ اليَهودِ سَألَ النَّبيَّ (ﷺ) عدَّةَ أسْئلَةَ كانَ منها قَوله: أينَ يَكونُ النّاسُ يَومَ تُبَدَّلُ الأرضُ غَيرَ الأرضِ وَالسَّموات؟ فَقالَ رَسُولُ الله (ﷺ): هُمْ في الظُّلْمَة دُونَ الجِسْرِ، قالَ: فَمَنْ أوَّلُ النّاسِ إجازَةً؟ قالَ: فُقَراءُ المُهاجِرينَ ...))[30].

واتە: زاناو گەورەیەکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەرو (ﷺ) و چەند پرسیارێکی لێکرد، یەکێك لەو پرسیارانە ئەوەبوو ووتی: خەڵکی لە کوێن لەو ڕۆژەی کە زەوی و ئاسمانەکان دەگۆڕدرێن (لە دواڕۆژدا)؟ پێغەمبەر (ﷺ)

---

مسلم (٦٣٤).

[30] رواه الإمام مسلم (٣١٥).

فەرمووی: بەڵێ خەڵکی لەو ڕۆژەدا لە تاریکاییدان لەسەر پردی (صِراط)، ئەویش ووتی: ئەی کێ یەکەم کەسە کە بەسەریدا دەپەڕێتەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: موسڵمانە هەژارە کۆچکردووەکانن.

وە کۆتا کەس کە بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات و تێدەپەڕێت پیاوێکە جارێك ئاسایی دەڕوات و جارێك بە دەما دەکەوێت و جارێك دەم و چاوی ڕەش دەبێت و هەڵاوی گەرمی دۆزەخی بۆ دێت و ئەمیش بەرگەی ناگرێت.

هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی مَسعُود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((آخِرُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَمْشِي عَلَى الصِّرَاطِ، وَهُوَ يَمْشِي مَرَّةً وَيَكْبُو مَرَّةً، وَتَسْفَعُهُ النَّارُ، فَإِذَا جَاوَزَهَا الْتَفَتَ إِلَيْهَا، قَالَ: تَبَارَكَ الَّذِي نَجَّانِي مِنْكِ، أَعْطَانِي شَيْئًا مَا أَعْطَاهُ أَحَدًا مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ ...))[٣١].

واتە: کۆتا کەس کە دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە کاتێك بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات، جارێك ئاسایی دەڕوات و جارێك بەدەمدا دەکەوێت و جارێك هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و ئازاری دەدات، کاتێك تێپەڕی بەسەریداو ڕزگاری بوو لێی، ئاوڕێك دەداتەوەو سەیرێکی دۆزەخ دەکات و دەڵێت: بەخششی زۆرە ئەو پەروەردگارەی کە منی لە تۆ ڕزگار کرد، بەڕاستی خوای پەروەردگار شتێکی بە من بەخشیوە (ڕزگاری کردم لە ئاگری دۆزەخ) بە هیچ شێوەیەك بە کەسی نەبەخشیوە نە لە پێشینان و نە لە کۆتاییان ...).

---

[٣١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧٥/٢٤)، والبخاري (٦٥٧١)، ومسلم واللفظ له (١٨٧).

وه فەرموودەیەكی ترمان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ((... يَأمُرُ اللهُ بِالصِّراطِ، فَيُضْرَبُ عَلى جَهنَّمَ، فَيَمُرُّ النَّاسُ عَلى قَدرِ أعمالِهِم زُمَراً زُمَراً، أوائِلُهُم كَلَمْحِ البرقِ، ثمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ، ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيرِ، ثُمَّ كَمَرِّ البَهائِمِ، حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ سَعْياً، وَحتّى يَمُرَّ الرَّجلُ مَشْياً، حتَّى يَمُرَّ آخِرُهُم يَتَلَـبَّطُ عَلى بَطْنِه، فَيَقولُ: يا رَبِّ، لِمَ بَطَّأتَ بِي؟ فَيَقولُ: إنِّي لَمْ أُبَطِّئْ بِكَ، إنَّما بَطَّأ بِكَ عَمَلُكَ ...)) [٣٢].

واتە: خوای پەروەردگار فەرمان دەكات كە پردی (صِراط) دابنرێت، كاتێك دادەنرێت لەسەر دۆزەخ، خەڵكی كۆمەڵ كۆمەڵ بە پێی كردەوەكانیان بەسەریدا دەڕۆن، یەكەم كۆمەڵیان بە وێنەی تیشك تێدەپەڕن بەسەریا، پاشان وەكو خێرایی با بەسەریا دەڕۆن، پاشان وەكو ڕۆیشتنی باڵندە، پاشان وەكو سوارچاكێكی باش، پاشان وەكو ڕۆیشتنی پیاوێكی خێرا، پاشان وەكو ڕۆیشتنی پیاوێكی ئاسایی، تا كۆتا كەس دێت تا بەسەریا بپەڕێتەوە، دەڕوات و بەسەر سك و پوویا دەكەوێت، دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ دوام دەخەیت و تاخیرم دەكەیت؟ خوای پەروەردگاریش پێی دەڵێت: من دوام نەخستوویت و هێواشم نەكردووی، بەڵكو كردەوەكانت هێواشی كردوویت و دوای خستوویت (واتە: كردەوەی چاكەت كەمە).

هاوەڵی بەڕێز أبوسَعید الخُدري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... ثُمَّ يُؤتَى بِالْجَسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ، قُلْنَا: يَا

---

[٣٢] أخرجه: إبن أبي شيبة ( ٣٧٦٣٧ )، والمروزي في "تعظيم قدر الصلاة" ( ٢٨٢ )، والطبري في"تفسيره" (١٧٠٦٣ )، والطبراني في "الكبير"( ٩٧٦١ )، والحاكم (٥٩٨/٤ -٥٦٠)، وحسن إسناده شعيب الأرناؤوط في "تخريج أحاديث جامع العلوم والحكم" لابن رجب (٣٠٨/٢) وقال: روي مرفوعا وموقوفا.

رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْجِسْرُ؟ قَالَ: مَدْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ، عَلَيْهِ خَطَاطِيفُ وَكَلَالِيبُ وَحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ، لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ تَكُونُ بِنَجْدٍ، يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ، الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا ...)) [٣٣].

واتـه: ... پاشـان پـردی (صِـــراط) دەهێنرێـت و لەسـەر پـشتی دۆزەخ دادەنرێـت، ووتمـان: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) پـردی (صِـــراط) چییە و چۆنە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پردی (صِراط) ڕێگەیەکـە زۆر لووسـە پێـی لەسـەر بەنـد نابێـت بـەڵکو هەڵدەخلیسکێت، لەسەر ئـەو ڕێگەیـە کۆمەڵـە قـولاپ و ڕاکێشەرێك هەیە، وە دڕکی (عُقَیفاءِ) پێوەیە کـە بەلەشـیانەوە دەنووسـێت و ڕایان دەکێشێت، پێی دەووترێت: (سَعدان) کە لە وولاتی نەجـد هەیـە، "ئـەو دڕکەیە کە بەلەشی ئاژەڵانەوە دەنوسێت بەڵام ئەوەی سەر پردی (صِـــراط) پێ دەچێ ئاسن بێت" ئیمانـداران بەسـەریا دەپەڕنـەوە هەیانـە وەکـو: چـاو تروکان دەپەڕێتەوە، وە هەیانە وەکو: تیشك دەپەڕێتەوە، هەیانە وەکـو: بـا دەپەڕێتـەوە، هەیانـە وەکـو: سوارچـاکێك دەپەڕێتـەوە، هەیانـە بـە پیـادە دەپەڕێتەوەو بەسەلامەتی ڕزگاری دەبێت، وە هەیانـە ڕزگـاری دەبێـت بـەڵام لـەش و دەم و چـاوی ڕووشـاوە، هەیانـە بەردەبێتـەوە نـاو ئـاگری دۆزەخ و ناتوانێـت بپەڕێتـەوە، هـەتا کۆتـا کەسـیان ڕزگـاری دەبێـت دەکـەوێت و هەڵدەستێتەوەو ڕادەکێـشرێت، بـەو حاڵـە ناخۆشـە بـەڵام ڕزگـاری دەبێـت، ...)).

---

[٣٣] رواه البخاري واللفظ له (٧٤٤٠)، ومسلم (١٨٣).

## شێوازەکانی بەر بوونەوە لەسەر پردی (صراط)ـەوە بۆ ناو دۆزەخ

چەند فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە کە باسی شێوازی بەر بوونەوە لەسەر پردی (صِراط)و کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخمان بۆ دەکات "خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان بپارێزێت لەو سەر ئەنجامە ناخۆش و ترسناکە":

**شێوازی یەکەم: المُكَرْدَس:**

ئەو شێوازەیە کە هەردوو دەست و پێی ئەو کەسە بە یەکەوە کەلەپچە دەکرێت و لەسەر پردی (صِراط)ـەوە هەڵدەدرێتە ناو دۆزەخەوە[٣٤]، هاوەڵی بەڕێز أبو سعيد الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... وَالأنبياءُ بِجَنْبَتَي الصِّراط، وَأَكْثَرُ قَولِهِم: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ، فَأكونُ أنا وَأُمَّتِي أوَّلَ مَنْ يَـمُرُّ، أو قالَ: أَوَّلُ مَنْ يُجيزُ، قالَ: فَيَمُرُّونَ عَلَيهِ مِثل البرقِ، وَمِثل الرِّيحِ، وَمِثل أجاويدُ الخَيلِ وَالرِّكابِ، فَـناجٌ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدوشٌ مُكَلَّمٌ، وَمُكَرْدَسٌ فِي النّار ...))[٢٩].

واتە: ... لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) لە تەنیشت پردی (صِراط)ـەوە دەوەستن و لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە تا شوێن کەوتوانیان بەسەلامەتی بپەڕنەوەو ڕزگاریان بێت، زۆربەی

---

[٣٤] بڕوانە: النهاية في غريب الحديث والأثر لابن الأثير (٤/١٦٢).

[٢٩] رواه ابن أبي عاصم في "السنة" (١/٢٨٤)، وقال الألباني في "ظلال الجنة": إسناده جيد وهو على شرط مسلم (٦٣٤).

پاڕانــەوەو ووتــەیان لــەو ڕۆژەدا ئەوەیــە کــە دەڵــێن: ئــەی پــەروەردگار سەلامەتیان بکە، ئەی پەروەردگار سـەلامەتیان بکـە، مـن و شـوێن کـەوتوانم یەکەم کەس و کۆمەڵین کە بەسەریا دەڕۆین، یـان فـەرمووی: یەکـەم کـەس و کۆمــەڵین کــە بەســەریا تێدەپــەڕین، وە فــەرمووی: خــەڵکی بەســەر پــردی (صِراط)دا دەڕۆن هەیانە بە وێنـەی تیشك تێدەپـەڕێت بەسـەریا، .......، وە هەیانە هەردوو دەست و پێی بە یەکـەوە کەلەپـچە دەکرێـت و لەسـەر پـردی (صِراط)ـەوە هەڵدەدرێتە شوێنێکی دۆزەخەوە.

**شێوازی دووەم: المَنْكُوس:**

بەربوونەوە لەسەر پردی (صِراط)ـەوە بۆ ئـاگری دۆزەخ بەسـەرەو خـواری (سەرت بەرەو خوارو، پێیەکانت بەرەو سەر) [٣٥]، هـاوەڵی بـەڕێز أبو سـعید الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ عَلَيْــهِ حَــسَكٌ، كَحَــسَكِ السَّعْدَانِ، ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَمَخدُوجٌ بِهِ "أي مخدوش"، ثُمَّ نَــاجٍ وَمُحْتَبِسٌ بِهِ، وَمَنْكُوسٌ فِيهَا ...)) [٣٦].

واتە: پاشان پـردی (صِــراط) دادەنرێـت لەسـەر پـشتی دۆزەخ، دڕکێکـی لەسەرە وەکو دڕکی (سَعدان) وایە، پاشان خەڵکی دەکەونـە ڕێ تـا بەسـەریا بپەڕنەوە، هەیانە بە سەلامەتی دەپەڕێتەوەو ڕزگاری دەبێت، هەیانـە لاشـەی

---

[٣٥] بڕوانە: شرح سنن إبن ماجه القزويني للسندي (٥٧٣/٢).

[٣٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٥٧/٢٤)، وابن ماجه (٤٢٨٠)، وإبن حبان (٧٤٢٩)، والحاكم (٦٢٨/٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٨١٨٩).

هەڵاوو گەرمی ئاگری بۆ دێت و بریندار دەبێت و لاشەی دەڕوشێت، بەڵام ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە ڕادەگیرێت، وە هەیانە سەرەو خوار دەکرێت و بەسەر سەرا بەردەدرێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ.

هاوەڵی بەڕێز مُعاذ کوڕی جَبَل (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ووتم: ((يَا رَسُولَ اللَّه، وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ قَالَ: "ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَوْ قَالَ: مَنَاخِرِهِمْ فِي النَّارِ إِلا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟)) [٣٧].

واتە: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئێمە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین سزا دەدرێین (لە سەر ووتەی خراپ و نابەجێ و تاوانی زمانمان)؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی لەبار دایکت بچویتایە مُعاذ، ئەمە گاڵتەیەك بووە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ "مُعاذ"دا کردوویەتی) بەڵێ، ئایا کاتێك خەڵکی بەسەر دەم و چاوو ڕویانا ڕادەکێشرێن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ هەمووی بە هۆی دروێنەی زمانیانەوە نییە (تاوانەکانی زمانیان)؟.

### شێوازی سێیەم: المَكْدوس:

بەربوونەوەو کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخ بە پشتا [٣٨]، خوای پەروەردگار هەواڵی داوە کە هاوەڵ بڕیاردەران و بێباوەڕان زۆر بە توندی هەڵدەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا

---

[٣٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٥٨)، والترمذي واللفظ له (٢٦١٦)، وابن ماجه (٣٩٧٣)، والحاكم (٢/٤٤٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٥١٣٦).

[٣٨] بڕوانە: النهاية في غريب الحديث والأثر، لابن الأثير (٤/١٥٥).

﴿١٣﴾ (الطور: ١٣).

واتە: لەو ڕۆژەدا پاڵیان پێوە دەنرێت و هەڵ دەدرێنە دۆزەخەوە چۆن پاڵ پێوە نان و هەڵدانێك (واتە: زۆر بە توندی).

هاوەڵی بەڕێز أبو سَعيد الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((... ثُمَّ يُؤتَى بِالجسرِ فَيُجْعَلُ بَين ظَهري جَهَنَّمَ، قُلنا: يا رَسولَ الله وَما الجسرُ؟ قالَ: مُدحضَةٌ مزلَّة، عَلَيه خَطاطِيفُ وكَلاليبُ وَحَسَكَةٌ مفلطحة، لَهَا شَوكَةٌ عقيفاء تَكونُ بنَجْد يُقالُ لَها: السَّعدان، المُؤمنُ عَلَيها كَالطَّرْفِ وَكَالبَرقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأجاويدِ الخَيلِ وَالرِّكاب، فَناجٌ مُسَلَّمٌ، وَناج مَخْدوش، وَمكدُوس في نارِ جَهَنَّمَ، حَتَّى يَمُرُّ آخِرُهُم يسحب سحبا ...)) [٣٩].

واتە: ... پاشان پردی (صِراط) دەهێنرێت و لەسەر پشتی دۆزەخ دادەنرێت، ووتمان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پرد چییە؟ فەرمووی: پردی (صِراط) ڕێگەیەکە زۆر لووسە پێی لەسەر بەند نابێت بەڵکو هەڵدەخلیسکێت، لەسەر ئەو ڕێگەیە کۆمەڵە قولاپ و ڕاکێشەرێك هەیە، وە دڕکی (عُقَيفاءِ) پێوەیە کە بەلەشیانەوە دەنوسێت و ڕایان دەکێشێت، پێی دەووترێت: (سَعدان) کە لە وولاتی نەجد هەیە، ئیمانداران بەسەریا دەپەڕنەوە هەیانە وەکو: ..... ، وە هەیانە ڕزگاری دەبێت بەڵام لەش و دەم و چاوی ڕووشاوە، وە هەیانە بە پشتا هەڵدەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو ناتوانێت بپەڕێتەوە، هەتا کۆتا کەسیان ڕزگاری دەبێت کەسێکە دەکەوێت و هەڵدەستێتەوەو ڕادەکێشرێت،

---

[٣٩] رواه البخاري واللفظ له (٧٤٤٠)، ومسلم (١٨٣).

بەو حاڵە ناخۆشە، بەڵام ڕزگاری دەبێت، ...)).

پاش باس کردن و وەصف کردنی ترسناکی پردی (صِراط)، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە خەڵکی لەسەری تووشی دوو ناخۆشی و ناڕەحەتی زۆر سەخت دەبن، ناخۆشی یەکەم: هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخ و سووتان لەسەر پردی (صِراط)، ناخۆشی دووەم: ئەو تاریکی و ناڕەحەتییەی کە لەسەر پردی (صِراط) هەیە.

## بەشــی دووەم: ناڕەحەتی سووتان لەسەر پردی (صِراط) و ئەو کارانەی دەبێتە مایەی ڕزگاری بوون لێی

ناڕەحەتی و ترسناکی ڕۆیشتن بەسەر پردی (صِراط)دا لەوەدا شاراوەتە کە بە پێی کردەوەکانت ڕۆیشتنت بەسەریدا دەبێت، واتە: ئەوەی ئەندازەی خێرایی ڕۆیشتنت دیاری بکات لەسەری تەنها کردەوە چاکەکانتە، تەنها کردەوە چاکەکانت توێشوو و هاوڕێتن لەسەری، وە تەنها کردەوە چاکەکانتە کە دەتوانێت بتپەڕێنێتەوە لە ڕێیەکی زۆر سەخت و دووروو درێژ کە ماوەکەی زۆر دوورە.

زانای پایەبەرز فُضَیلِ کوڕی عِیاض (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: درێژی ڕێگای پردی (صِراط) و ماوەی کۆتایی هاتنی پانزە هەزار ساڵە [٤٠].

هاوەڵی بەڕێز عَبداللە کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ منها بِأعمالِهِم، فَأوَّلُهُم كَلَمْحِ البرق ثُمَّ كَالرِّيحِ ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ "أي كَجَري الفَرَسِ" ثُمَّ كَالرّاكِبِ فِي رَحْلِهِ ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ ثُمَّ كَمَشْيِهِ)) [٤١].

---

[٤٠] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري لإبن حجر العسقلاني (٤٦٢/١١ ح ٦٥٧٤)، وە "البدور السافرة في أمور الآخرة" للسيوطي (صفحة ٣٣٤) (ح ١٠٢٥)، وقال إبن حجر رحمه الله تعالى في الفتح: أخرجه إبن عساكر في ترجمته وهذا معضل لا يثبت. أهـ. واتە: ئەو فەرموودەیەی کە باسی درێژی پردی (صِراط) دەکات، فەرموودەیەکی "مُعْضَلَ" صەحیح نییەو ناکرێتە بەڵگە.

[٤١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٠٩/١٨)، والترمذي (٣١٥٩)، والدارمي (٢٨١٠)، والحاكم (٥٨٦/٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترمذي" (٢٥٢٦).

واتـه: خـەڵكی دێنـه دیار ئـاگری دۆزەخ، پاشـان بـه پێـی كردەوەكانیـان ڕزگاریان دەبێت و تێدەپەڕن بەسەر پردی (صِـــراط)دا، یەكـەم كەسیان بـه وێنـەی تیـشك دەپـەڕێتــەوە، پاشـان وەكـو بـا، پاشـان وەكـو ڕۆیـشتنی سوارچـاكێك، پاشـان وەكـو سـوارییەكی ئاسـایی، پاشـان وەكـو ڕۆیـشتنی پیاوێكی باش، پاشان وەكو ڕۆیشتنی پیاوێكی سادەو ئاسایی.

موسـڵمانی خۆشەویـست تـەنها كـردەوە چـاكەكانتە كـە دەتوانیــت بــه هۆیانـەوە زۆر بـه خێرایـی بەسـەر پـردی (صِـــراط)دا بڕۆیت و بەسـەلامەتی بپەڕیتەوەو ڕزگارت بێت، وە خەڵكی زوو پەڕینەوەو خێراییـان لەسـەر پـردی (صِراط) جیاوازە ئەویش بە هۆی جیاوازی پلەو پایەو كردەوە چـاكەكانیانە، بۆچی كەسێك لە دواڕۆژدا كاتێك دەیەوێت بەسەر پردی (صِراط)دا تێپەڕ ێت ناتوانێت مەگـەر بـه سـكە خـشكێ نـەبێت؟ ئایـا بـه هـۆی كـەمی كـردەوە چاكەكانییەوە نییە؟ یان بە هۆی نەمانی ئەو هێزەوە نییە كە پاڵی دەنێت بۆ ڕۆیـشتن بـەرەو پێـشەوە؟ وە یـان لەبـەر ئـەوەی لـە دونیـادا پێـشبڕكێی نەكردووە بۆ زیاد كردنی كردەوەی چاكە؟ لە كاتێكدا زۆر خێراو ئـازابووە بـۆ كۆكردنەوەی ماڵ و سامانی دونیای بەسەرچوو، خۆی زۆر ماندوو كـردووە بـۆ بەدەست هێنانی دونیا، بەڵام دواڕۆژی لەبیر كردووە یان گوێی پێنەداوە.

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَمَرِّ الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ، ثُمَّ يَرْجِعُ فِي طَرْفَةٍ، ثُمَّ يَمُرُّ كَمَرِّ الرِّيحِ، ثُمَّ يَمُرُّ كَمَرِّ الطَّيْرِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرِّجَالِ تَجْرِي بِهِمْ أَعْمَالُهُمْ، وَنَبِيُّكُمْ (ﷺ) قَائِمٌ عَلَى الصِّرَاطِ، يَقُولُ: سَلِّمْ، حَتَّى تَعْجِزَ أَعْمَالُ النَّاسِ، حَتَّى يَجِيءَ الرَّجُلُ لا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَمُرَّ إِلا زَحْفًا، وَفِي حَافَتَيِ الصِّرَاطِ كَلالِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ

تَأْخُذُ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ، فَنَاجٍ مَخْدُوشٌ، وَمَكْدُوسٌ فِي النَّارِ))، والَّذي نَفْسُ أَبِي هُرَيرَةَ بِيَدِهِ، إنَّ قَعْرَ جَهَنَّمَ لَسَبْعُونَ خَرِيفاً))[٤٢].

واتە: یەکەم کەستان بە وێنەی تیشك دەپەڕێتەوە، هەروەك چۆن لە چاو تروکانێکدا دێت و دەڕوات، پاشان وەکو خێرایی با، پاشان وەکوڕۆیشتنی باڵندە، پاشان وەکو ڕۆیشتنی پیاوێکی سادەو ئاسایی، خەڵکی بەپێی کردەوەکانیان بەسەریدا دەڕۆن، وە پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) لەسەر پردی (صِراط) دەوەستێت و دەڵێت: ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، تا کردەوەکان بێ توانا دەبێت لە پەڕاندنەوەی خەڵکی لەسەر پردی (صِراط)، تا وای لێدێت پیاوی وا هەیە ناتوانێت بەسەر پردی (صِراط)دا بڕوات مەگەر بە سکە خشکێ، وە بەم لاو بەولای پردی (صِراط)ـەوە قولاپی ئاسنی پیا هەڵواسراوە، فەرمانی پێکراوە ئەو کەسانە ڕابکێشێت کە فەرمانی ڕاکێشانیان کراوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، هەیانە لاشەی هەڵاوو گەرمی ئاگری بۆ دێت و بریندار دەبێت و دەڕوشێت، بەڵام ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە پاڵی پێوە دەنرێت و بە پشتا بەردەدرێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ.

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: سوێند بێت بەو خوایەی کە گیانی منی بە دەستە قوولی دۆزەخ حەفتا پایزە (واتە: حەفتا ساڵە).

واتە: ئەگەر بەردێکی گەورە بەربدرێتەوە ناو دۆزەخ بە حەفتا ساڵ ئینجا دەگاتە بنەوەی دۆزەخ.

---

[٤٢] رواه الإمام مسلم (١٩٥)، والحاكم (٦٣١/٤).

مرۆڤـ ناتوانێت بە هێزو دەسەڵات و ویستی خۆی بەسەر پردی (صِراط)دا بڕوات و بە سەلامەتی ڕزگاری بێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکاتی، بەڵکو کردەوە چاکەکانی دەتوانێت بیپەڕێنێتەوەو ڕزگاری بکات لێی.

موسڵمانی خۆشەویست بیرێك بکەوە لە حاڵی ئەو کەسەی کە بە سکەخشکێ بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات و ئاگری دۆزەخ لە ژێریەوەیەتی، گڕوو تین و هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت، ئاخۆ دەبێت کەی و بە ماوەی چەند بتوانێت پردی (صِراط) ببڕێت و ڕزگاری بێت لە ترسناکی و ناڕەحەتیەکەی؟ وە ئایا دەبێت چەند ترس و بیم دایبگرێت بە هۆی بینینی دۆزەخ و گەرمی ئاگرەکەی، ئەو ئاگرەی کە گەرمییەکەی حەفتا جار زیاترە لە گەرمی ئاگری دونیا، یان گەرمییەکەی سەد جار زیاترە لە گەرمی ئاگری دونیا؟.

هەروەك هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً. قَالَ: فُضِّلَتْ عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا))[٤٣].

واتە: ئاگری دونیاتان بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، ووترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر گەرمی ئاگری دۆزەخ تەنها بە وێنەی ئاگری دونیا بێت بەسە بۆ ئەوەی سزای پێ بچێژین و بمان سووتێنێت؟ پێغەمبەر

---

[٤٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٦٤)، والبخاري واللفظ له (٣٢٦٥)، ومسلم (٢٨٤٣)، والترمذي (٢٥٩٠)، وابن ماجه (٤٣١٨)، والدارمي (٢٨٤٧).

(ﷺ) فەرمووی: دەی گەرمی ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ جار زیاترە لە گەرمی ئاگری دونیا، هەر بەشە گەرمییەکیشی بە وێنەی گەرمی ئاگری دونیایە، لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: ((هَذِهِ النَّارُ جُزْءٌ مِنْ مِائَةِ جُزْءٍ مِنْ جَهَنَّمَ)) [٤٤].

واتە: ئاگری دونیاتان بەشێکە لە سەد بەشی ئاگری دۆزەخ، واتە: گڕوو تین و گەرمی ئاگری دۆزەخ سەد ئەوەندەی گەورەترین و سوتێنەرترین ئاگری دونیایە (خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان بپارێزێت لێی).

موسڵمانی خۆشەویست بیر بکەوە لە حاڵی کەسێك بە ڕێیەکی ئاگراویدا بڕوات جا بە پیادەو ئاسایی بێت یان بە خێرایی تیشك بێت، ئایا هەست بە گەرمی ئەو ئاگرە دەکات ئەگەر بە خێرایی تیشك بڕوات؟ بێگومان بەڵێ، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت ئەگەر بە سکە خشکێ بەسەر ئەو ڕێگا ئاگراویەدا بڕوات؟ یان جارێك هەستێت و جارێك بە ڕوودا بکەوێت؟ بەڵێ ئەگەر ئەوە حاڵی بێت بە هۆی ئاگری دونیاوە، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت لە کاتێکدا بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات و ئاگری دۆزەخی لە ژێرەوە بێت؟ ئەو ئاگرەی کە لە پێشدا زانیت چەند بە تین و سووتێنەرە.

---

[٤٤] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٦٤/٢٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٧٠٠٦).

## بۆچی کردەوەی بەندەکان لەسەر پردی (صِراط) بێ‌توانا دەبێت؟

موسڵمانی خۆشەویست بیرێك بکەوە لە حاڵی ئەو کەسانەی کە لەسەر پردی (صِراط) کردەوەکانیان بێ توانا دەبێت و ناتوانێت بیان پەڕێنێتەوە؟ ئایا دەبێت هۆکار چی بێت؟ ئایا تەنها لەبەر ئەوە نییە کە لە دونیادا تەمەنیان لە پەرستن و ڕازی کردنی خوای پەروەردگاردا سەرف نەکرووە؟ بەڵکو کالآیەکی خراپیان پێیە، چەند کردەوەیەکی چاکی کەم تێکەڵیان کردووە بە تاوان و خراپەکارییەکی زۆر.

زانای پایەبەرز الملا علـي القـاري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) سەبارەت بە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((حَتَّى يَجِيءَ الرَّجُلُ فَلاَ يَسْتَطِيعُ السَّيْرَ إِلاَّ زَحْفًا)).

دەڵێت: واتە: پیاوێك کاتێك ناتوانێت بە باشی بەسەر پردی (صِـراط)دا بڕوات تەنها بە سکە خشکێ نەبێت، هۆکارەکەی ئەوەیە: کردەوەی چاکەی کەمە، لە دونیادا پێشبڕکێی نەکردووە بۆ کردنی کردەوەی چاکە، بەڵکو کەسێکی تەمبەڵ بووەو پاڵی لێدابووەوەو کردەوەی چاکەی زۆر کەم کردووە، بۆیە لەسەر پردی (صِـراط) ناتوانێت بڕوات مەگەر بە گاوڵکێ و سکەخشکێ نەبێت [٤٥].

موسڵمانی خۆشەویست ئایا پاش ئەمە کەسێك هەیە لە ئێمە بیرێك لە

[٤٥] بڕوانة: "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" للملا علي القاري (٩/٥٧٤).

حاڵی خۆی نەکاتەوەو هەوڵی ڕزگار بوون نەدات لەو هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتیانەی سەر پردی (صِراط)؟ ئایا کەسێك لە ئێمە هەیە کاتەکانی ژیانی بە فیڕۆ بدات، تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار دوا بخات؟ لە کاتێکدا لە پێشمانەوە چەندین کۆسپ و ڕێگرو ناخۆشی و ناڕەحەتی هەیە، ڕزگار بوون لێیان هەروا ئاسان نییە، مەگەر بە گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگارو کردنی کردەوەی چاکەی زۆرو خۆ پاراستن لە خراپەو تاوان.

تەنها کردەوە چاکەکان هاوڕێ و هاوەڵمانن لەسەر پردی (صِراط)، خێرا ڕۆیشتن و پەڕینەوە لەسەر پردی (صِراط) بە سەلامەتی تەنها بە کردەوە چاکەکان دەبێت، نەك بە ناوو پلەو پایەو ماڵ و سەروەت و سامانی زۆر.

هاوەڵی بەڕێز أبو هُريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، ....، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ)) [٤٦].

واتە: هەر موسڵمانێك ناخۆشی و ناڕەحەتییەك لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دونیا لەسەر ئیمانداریێك لابەرێت و باری سەرشانی سووك بکات، ئەوە خوای پەروەردگار ناڕەحەتییەك لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دواڕۆژی لەسەر لادەبات، ......، وە هەرکەسێك کردەوەکانی دوای بخات لەسەر پردی (صِراط) ئەوە بە هیچ شێوەیەك کەس و کارو ناودارییەکەی خێرای ناکات (تا بتوانێت بە خێرایی بەسەر پردی (صِراط)دا بپەڕێتەوە.

---

[٤٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني"(١٩/٦٥)، ومسلم واللفظ له (٢٦٩٩)، والترمذي (١٤٢٥)، وأبو داود (٤٩٤٦).

خەڵکی لە دونیادا زۆر هەوڵ دەدەن بۆ بەدەست هێنانی ئامێری خێراو پێشکەوتوو بۆ گواستنەوەو هاتوچۆ کردن لە گەشتەکانیاندا، هەرچەندە ماڵ و پارەی زۆریش سەرف بکەن بۆ بەدی هێنانی، کەسی وا هەیە دەیبینیت کاتێك گەشتێك دەکات بۆ وولاتێکی دوور، بە تەیارە گەشت دەکات هەرچەندە پارەی زۆرتر تێبچێت وەك لە سەیارە، تەنها مەبەستی ئەوەیە بەزووترین کات بگات و تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی ئەو گەشتە نەبێت، تەنها بۆ ڕزگار بوونە لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دونیا، دەی موسڵمان بیرێك بکەوە ئایا بۆ تۆی موسڵمان باشترو لە پێشتر نییە کە هەوڵی کردنی کردەوەی چاکە زۆر بدەیت تا بە ئاسانترین و خێراترین شێوە بەسەر پردی (صراط)دا بپەڕیتەوەو ڕزگارت بێت لێی؟ چونکە پردی (صِـراط) ڕێگەیەك نییە بە ڕاخەری نەرم و جوان و دیمەنی سەرنج ڕاکێش نەخشێنرابێت، بەڵکو ڕێگەیەکی تەنگی خلیسکە، هەمووی قولاپ و ناخۆشی و سزاو سووتانە.

هاوەڵی بەڕێز عَبداللە کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((... يَأمُرُ اللهُ بالصِّراطِ، فَيُضْرَبُ عَلى جَهَنَّمَ، فَيَمُرُّ النَّاسُ عَلى قَدَرِ أعمالِهِم زُمَرَاً زُمَرَاً، أوائلُهُم كَلَمْحِ البَرْقِ، ثُمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ، ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيرِ، ثُمَّ كَمَرِّ البَهائِمِ، حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ سَعْياً، وَحتَى يَمُرَّ الرَّجُلُ مشياً، حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يَتَلَبَّطُ عَلى بَطْنِه، فَيَقولُ: يا رَبِّ، لِمَ بَطَّأتَ بِي؟ فَيَقولُ: إنِّي لَمْ أبَطِّئ بِكَ، إنَّما بَطَّأَ بِكَ عَمَلُكَ ...)) [٤٧].

---

[٤٧] أخرجه: إبن أبي شيبة (٣٧٦٣٧)، والمروزي في "تعظيم قدر الصلاة " ( ٢٨٢ )، والطبري في "تفسيره" (١٧٠٦٣)، والطبراني في "الكبير"(٩٧٦١)، والحاكم (٤/٥٩٨-٥٦٠)، وحسن إسناده شعيب الأرناؤوط في "تخريج أحاديث جامع العلوم والحكم" لإبن رجب(٢/٣٠٨) وقال: روي مرفوعا وموقوفا.

واتە: خوای پەروەردگار فەرمان دەکات کە پردی (صِراط) دابنرێت، کاتێك دادەنرێت لەسەر دۆزەخ، خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ بە پێی کردەوەکانیان بەسەریدا دەڕۆن، ........، تا کۆتا کەس دێت تا بەسەریا بپەڕێتەوە، دەڕوات و بەسەر سك و ڕوویا دەکەوێت، دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ دوام دەخەیت و تاخیرم دەکەیت، خوای پەروەردگاریش پێی دەڵێت: من دوام نەخستویت و هێواشم نەکردووی، بەڵکو کردەوەکانت هێواشی کردوویت و دوای خستویت.

ئەمەش ڕاستێتی ئەو فەرموودەیەمان بۆ دەردەخات کە هاوەڵی بەڕێز أبـــوذَرّ (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەویش لە خوای پەروەردگارەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((... يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُم ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلا يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ)) [٤٨].

واتە: ... ئەی بەندەکانم ئەوەی کە دەیبینن (لە دواڕۆژدا) تەنها کردەوەکانی خۆتانە کە من بە تەواوی و بە ڕێکی بۆم ژماردبوون و بۆم نوسیبوون (بە زانیاری خۆم، وە بەهۆی فریشتەکانمەوە)، پاشان پاداشتی تەواوتان دەدەمەوە لەسەری، پاداشتی چاکە بە کردەوە چاکەکانتان، وە سزاش بە تاوان و خراپەکانتان، هەر کەسێك کاری چاکەو پاداشتی باشی

---

[٤٨] رواه الإمام مسلم (٢٥٧٧)، وأخرجه أيضاً: معمر في "جامعه"( ٢٠٢٧٢ )، والطيالسي ( ٤٦٣ )، وأحمد ٥/١٥٤ و١٦٠ و١٧٧، وهناد في "الزهد" ( ٩٠٥ )، والبخاري في "الأدب المفرد" ( ٤٩٠ )، وابن ماجه ( ٤٢٥٧ )، والترمذي ( ٢٤٩٥ )، والبزار ( ٤٠٥١ ) و ( ٤٠٥٢ ) و ( ٤٠٥٣ )، وابن حبان ( ٦١٩ )، والطبراني في "مسند الشاميين" ( ٣٣٨ ) و( ٢٨١١ )، والحاكم ٤/٢٤١، وأبو نعيم في "الحلية" (٥/١٢٥ – ١٢٦)، والخطيب في "تأريخه" ٧/٢٠٣ - ٢٠٤.

بینی ئەوە با تەنها سوپاسی خوای پەروەردگار بکات (چونکە تەنها خوای پەروەردگار یارمەتی داوە بۆ کردنی کردەوەی چاکە نەك بە هێزو توانای خۆی)، وە هەرکەسێك جگە لەوەی بینیی (کردەوەی خراپ و سزای بینی) ئەوە با سەرزەنشتی هیچ کەس نەکات تەنها نەفسی خۆی نەبێت.

## سزای کەسی تەمبەڵ و کەمتەرخەم لەسەر پردی (صراط)

کەسانی تەمبەڵ و لەسەرخۆ لە پەرستنی خوای پەروەردگاردا، دەبێت لەسەر پردی (صِراط) باج و نرخی ئەو تەمبەڵی و کەمتەرخەمییەیان بدەن، وە دەبێت باج و نرخی ئەو گاڵتەکردنەیان بدەن کاتێك بانگەوازکاران بانگیان دەکردن تا وەڵامی خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بدەنەوە، بەڵام گاڵتەیان پێدەکردن و گوێیان پێنەدەدان، نرخی تەمبەڵی و گاڵتەجاڕیەکەشیان ئەوەیە: لەسەر پردی (صِراط) زۆر بە خاوی و هێواشی دەڕۆن، دواکەوتن و خاو ڕۆیشتنیان لەسەر پردی (صِراط) بە هۆی کەمی کردەوەی چاکەیانە، هەر بۆیە بەهۆیەوە تووشی دوو جۆر سزا دەبن:

**یەکەم**: کاتێك بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن تووشی گڕوو تین و هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخ دەبن:

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... والصِّراط كَحَدِّ السَّيْفِ دَحْضُ مَزِلَّةٍ، قَالَ:

وَيَقُولُ: مُرُّوا، فَيَمُرُّونَ عَلَى قَدْرِ نُورِهِمْ، مِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَطَرْفِ الْعَيْنِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالْبَرْقِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالسَّحَابِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَانْقِضَاضِ الْكَوْكَبِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالرِّيحِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَشَدِّ الرَّجُلِ وَيَرْمَلُ رَمْلاً، فَيَمُرُّونَ عَلى قَدَرِ أعمَالِهِم، حَتّى يَمُرُّ الذّي نُورُهُ عَلى إبْهامِ قَدَمَيه، تَخِرُّ يَدٌ وَتَعْلَقُ يدٌ، وتَخِرُّ رِجْلٌ، وَتَعْلَقُ رِجْلٌ، فَتُصِيبُ جَوَانِبَهُ النَّارُ)) [٤٩].

واتـه: ... پـردی (صِـراط) بـه وێنـەی دەمـی شمـشێر تیـژه، خلیـسکەو پێیەکان لەسەری خۆی ناگرێت، دەفـەرمووێت: پێیـان دەوترێـت: بەسـەریدا بڕۆن، خەڵکیش بـه پێـی ئـەو نـورو ڕوناکییـەی پێیـان بەخـشراوه بەسـەریدا دەڕۆن، هەیانه بە خێرایی چاو تروکان بەسەریدا دەڕوات و دەپەڕێتـەوە، وه هەیانە بە خێرایی تیشك و بـه وێنـەی خێرایـی هـەور، وه هەیانـه بـه وێنـەی ئەستێره کشان، وه هەیانـه بـه خێرایـی بـا، وه هەیانـه بـه وێنـەی ڕاکردنـی پیاوێك بە خێرایی، به پێی کردەوەکانیـان بەسـەریدا ئەپەڕنـەوە، تـا ئەگاتـه ئەو کەسەی کە نورو ڕوناکییەی بەسەره پەنجەیەوەیەتی (زۆر کەمە)، جارێك بەسەر دەستیدا دەکەوێت و جارێك دەستی هەڵدەگرێتەوە، وه جارێك بەسەر چۆکدا دەکەوێت و جارێك هەڵدەستێتەوە، ئاگر ئەملاو ئەولای ئەو موسڵمانە دەگرێت و دەیسووتێنێت.

**دووەم:** ڕووشان و بریندار بوونی لاشەیان بەو قولاپانەی کە هەڵواسراوە بەملاو بەولای پردی (صِراط)ـەوە، هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((فَيُضْرَبُ الصِّراطُ بَينَ

---

[٤٩] رواه الحاكم واللفظ له (٤/٦٣٣)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٢٩).

ظَهراني جَهَنَّمَ، فَأكونُ أوَّلُ مَن يجوز مِنَ الرُّسُلِ بأُمَّته، وَلا يَتكَلَّمُ يَومَئذ إلا الرُّسُلُ، وَكَلامُ الرُّسُلِ يَومَئذٍ: اللّهُمَّ سَلّمْ سَلّمْ، وَفِي جَهَنَّمَ كَلاَليبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَان، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَان، قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَان، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو،...)) [٥٠].

واته: پاشان پردی (صِراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت، من یەکەم پێغەمبەر (ﷺ) دەبم کە ئوممەتەکەمی بەسەردا دەپەڕێنمەوە،........ ، هەیانە لە ناو دەچێت، سزاو ئێش و ئازار زۆر دەبینێت بە هۆی کردەوە خراپەکانییەوە، وە هەیانە قولاپەکانی تەنیشت پردی (صِراط) ڕایدەکێشێت و گۆشتی لاشەی پارچە پارچە دەکات، بەڵام لە دواییدا ڕزگاری دەبێت، ...).

زانای پایەبەرز الملا علــي القــاري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتوویەتی: (يُخَرْدَلُ): واتە: پارچە پارچە کراو بە وێنەی دەنکە خەرتەلە، (وَالْمُخَرْدَلُ): واتە: بڕاوو پارچە پارچە کراو کە قولاپە هەڵواسراوەکانی ئەملاو ئەولای پردی (صِراط) وای لێکردووە، بەڵام ئەم کەسە پاش ئەو هەموو ناڕەحەتییە ڕزگاری دەبێت [٥١].

---

[٥٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٥٧/٢٤)، والبخاري (٨٠٦)، ومسلم (١٨٢)، وابن ماجه (٤٢٨٠).

[٥١] بڕوانە: مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح للملا علي القاري (٥٤١/٩).

## بیرکردنەوەو تێڕامانێك لە پردی (صِراط)

زانای پایەبەرز ئیمامی القُرطبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتوویەتی: هەر ئێستا بیربکەوەو بیهێنە پێش چاوت دڵت چۆن دەکەوێتە لەرزین کاتێك چاوت بە پردی (صِراط) و باریکییەکەی دەکەوێت، پاشان چاوت بە تاریکی و ڕەشی دۆزەخ دەکەوێت لە ژێرییەوە، پاشان گوێ بیستی ناڵەو تووڕەیی ئاگری دۆزەخ دەبیت، وە فەرمانت پێکراوە بەسەریا بڕۆیت لەگەڵ بێ توانایی و بێ دەسەڵاتیت، وە لەرزین و لێدانی دڵت لە ترسا، وە خلیسکان و خۆ نەگرتنی پێیەکانت لەسەری، وە قورسی شانت بە تاوان و خراپەکانت، ئەو تاوانانەی کە لە دونیادا باری گران کردبوویت نەتدەتوانی بە ئاسانی بەسەر زەویدا بڕۆیت چ جای بتوانیت بەسەر پردی (صِراط)ی تیژو خلیسکی دۆزەخدا بڕۆیت و خۆت بگریت لەسەری؟ ئەی دەبێ حاڵت چۆن بێت لە کاتێکدا یەکەم پێت نایە سەری و هەستت بە تیژی و خلیسکیەکەی کردوو ناچار کراویت پێی دووەمت هەڵنێیت بۆ ڕۆیشتن بەسەریدا؟ خەڵکی لە پێشتەوە پێیان هەڵدەخلیسکێت و بەردەبنەوەو فریشتە زۆر تووڕەو بێبەزەییە فەرمان پێکراوەکانی دۆزەخ ڕایان دەکێشن بۆ ناو دۆزەخ، ئەوە حاڵیانەو تۆش سەیریان دەکەیت و بە چاوەکانی خۆت سزایان دەبینیت، چۆن سەرەو خوار هەڵدەواسرێن، سەریان بۆ خوارەوەو قاچیان بۆ سەرەوە، ئای دیمەنێکی چەند ترسناکە، وە سەرکەوتنێکی چەند قورس و گرانە، وە

تێپەڕبوون و بڕینی ڕێگەیەکی چەند تەسك و تەنگ و سەختە؟!!![52].

## ئەو کارانەی دەبنە مایەی ڕزگار بوون لە گەرمی و کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخەوە

کردەوە چاکەکان زۆرن کە یارمەتی دەری خاوەنەکانیان دەبن تا لەسەر پردی (صِراط) پێیان جێگیر بێت و بە سەلامەتی بپەڕنەوەو ڕزگاریان بێت، بێ ئەوەی هەلاوی گەرمی ئاگری دۆزەخ بیان گرێت یان بکەونە ناوی، هەروەك چۆن چەند کارێکی چاکە هەیە کە بە هۆیانەوە خاوەنەکەی دەتوانێت زۆر بە خێرایی و بێ ماندوو بوون و دوا کەوتن پردی (صِـراط) ببڕێت و بە سەلامەتی ڕزگاری بێت، هەر دوو جۆرە کردەوەکان تەواوکەری یەکترین، بۆیە پێویستە موسڵمان زۆر گرنگیان پێبدات.

موسڵمانی خۆشەویست لێرەدا باسی ئەو کردەوە چاکانە ناکەم کە موژدەی چوونە بەهەشت بە خاوەنەکەی دراوە، لەبەر ئەوەی بەڵگەی ئەوەیان تێدا نییە کە خاوەنەکەی هەر لە سەرەتاوەو بێ سزا ڕزگاری دەبێت، بەڵکو لێرەدا باسی ئەو کردەوانە دەکەم کە خوای پەروەردگارو پێغەمبەری (ﷺ) خۆشەویست موژدەی ڕزگار بوونیان لە سووتان و هەلاوی گەرمی ئاگری دۆزەخ بە خاوەنەکەی داوە، کە ئەمەیان زیاتر بەڵگەیە لەسەر ڕزگار بوون لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِـراط)و پاشان

---

[52] بڕوانە: التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة للقرطبي، تحقيق مجدي السيد، (٢/٤٣).

چوونه ناو بەهەشتەوە.

هاوەڵی بەڕێز أبـوذَرّ (خـوای لـێ ڕازی بێت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أَتَانِي جِبْرِيلُ فَبَشَّرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ. قُلْتُ: وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟ قَالَ: وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟)) [٥٣].

واتە: جبریل (عليه السلام) هات بۆلام و موژدەی پێدام و دڵخۆشی کردم بەوەی کە هـەر موسـڵمانێك بمرێـت و بـە هـیچ شـێوەك هـاوەڵ و شـەریکی بـۆ خـوای پەروەردگار بڕیار نەدابێت دەچێتە بەهەشتەوە (ئەگەر لەسـەرەتاوە بشـچێتە ناو دۆزەخەوە بە هۆی تاوانەکانییەوە)، أبوذَرّ (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەڵێـت، ووتم: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەگـەر ئـەو موسـڵمانە دزی کردبێـت و زیناشـی کردبێت هەر دەچێتە بەهەشتەوە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: بـەڵێ، ئەگـەر ئەو موسڵمانە دزی کردبێت و زیناشی کردبێت هەر دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەوەی کە زانراوە دزی کردن و زینا کردن لە تاوانە گەورەکانە ئەگـەر هـەر موسڵمانێك بیان کات ئەوە هەڕەشەی ئاگری دۆزەخی لێکراوە، بـەڵام لێـرەدا پێدەچێت مانای فەرمودەکـە ئـەوەبێت: هـەر کەسـێك ئـەو تاوانانـە بکـات و موسـڵمان بێـت ئـەوە سـەر ئـەنجامی هـەر چـوونە نـاو بەهەشـتە، جـا لەسەرەتاوەو بێ سزا بێت، خوای پەروەردگار بیکاتە بەهەشتەوە ئەگەر ئـەو تاوانانەشی کردبێت، یان پاش ئەوەی بە پێی ئەو تاوانانـەی سـزا بکێشێت و پاشان ڕزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە.

موسـڵمانی خۆشەویـست لـەم بەشـەدا باسـی ئـەو کردەوانـە دەکـەم کـە

---

[٥٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٠٣/١٩)، والبخاري واللفظ له (٧٤٨٧)، ومسلم (٩٤)، والترمذي (٢٦٤٤).

پێیەکان بە هۆیانەوە لەسەر پردی (صِراط) جێگیر دەبێت، یان ڕزگارکەرن لە سووتان و هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخ، یان ڕزگارکەرن لە کەوتنە ناو ئاگری دۆزەخ، بەڵام ئەو کردەوانەی کە دەبنە مایەی زوو پەڕینەوەو خێرا ڕۆیشتن بەسەر پردی (صِراط)دا لە بەشی سێیەم لە باسی ناخۆشی و نارەحەتی و تاریکی سەر پردی (صِراط) و ئەو کردەوانەی کە دەبنە مایەی ڕووناك کەرەوەی، باس دەکەم.

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە ئەو موسڵمانانەی کە بەشداری جەنگی (بَدرُ) و (بَیعَةُ الرِّضوان)یان کردووە، کەسیان ناچنە دۆزەخەوە، هاوەڵی بەڕێز جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بەندەیەکی (کۆیلەیەکی) حاطَبِ کوڕی بَلْتَعَة هاتە لای پێغەمبەرو (ﷺ) شکاتی لە حاطَب کردوو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حاطَب دەچێتە دۆزەخەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((كَذَبْتَ لا يَدْخُلُهَا، إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ)) [٥٤].

واتە: ڕاستت نەکرد، حاطَب ناچێتە دۆزەخەوە، چونکە ئەو کەسێکە بەشداری جەنگی (بَدرُ) و سوڵحی (حُدَیبیة)ی کردووە.

هەروەها دایکی ئیمانداران خاتوو حَفصَة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنِّي لأَرْجُو أَلاَّ يَدْخُلَ النَّارَ أَحَدٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ قَالَ: أَلَمْ تَسْمَعِيهِ يَقُولُ:

---

[٥٤] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٢/١٩٣)، ومسلم (٢٤٩٥)، والترمذي (٣٨٦٤).

﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾ (مريم: ٧٢-٧٣) [٥٥].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئومێدم وایە هیچ یەکێك لەو موسڵمانانە نەچێتە دۆزەخەوە کە بەشداری جەنگی (بَدر) و سوڵحی (حُدَيبية)یان کردووە (إنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى)، خاتوو حَفْصَةَ (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: ووتم: ئەی ئەوە نییە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ واتە: کەس نییە لە ئێوە تێنەپەڕێت و نەڕوات بەسەر دۆزەخدا یان بە ناویدا، ئەو ڕۆیشتنە بڕیارێکی بڕاوەیە لە لایەن پەروەردگارتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی گوێبیستی فەرموودەی خوای پەروەردگار نەبوویتە کە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾ پاشان ئەوانە ڕزگار دەکەین کە خواناس و پارێزگار بوونە، وە ستەمکاران لە دۆزەخدا دەهێڵینەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو موسڵمانانەی بەشداری ئەو ڕوداوە گەورانەی وەکو جەنگی (بَدرُ) و (الحديبية) و (بَيعَةُ الرِّضوان)یان نەکردبێت ئایا لەسەر پردی (صِراط) دەکەونە خوارەوەو دەچنە دۆزەخەوە؟

نەخێر، پێغەمبەری (ﷺ) زۆر خۆشەویست و دڵسۆزو خەمخۆری ئوممەتەکەی باسی چەندین کاری چاکەی بۆ کردووین کە دەبنە هۆکاری جێگیر بوونی پێیەکانمان لەسەر پردی (صِـراط)، وە باسی زۆر لەو کارە چاکانەی بۆ کردووین کە خاوەنەکەی دەپارێزێت لە چوونە دۆزەخەوە،

---

[٥٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٢/١٩٤)، وابن ماجه (٤٢٨١)، وصححه الألباني في "صحيح ابن ماجه" (٣٤٥٤).

موسڵمانی خۆشەویست ئـەوەی لێرەدا دەردەکـەوێت ئەوەیـە: هێك ڕزگـاری بێت لە ئاگری دۆزەخ ئەوە بێگومـان پـردی (صراط)ی بـە سـەلامەتی بڕیـوەو ڕزگـاری بـووە لـە ناخۆشـی و ناڕەحەتییـەکانی، خـوای پـەروەردگار هـەموو لایەکمان بە سەلامەتی ڕزگار بکات.

## ئەو كردەوە چاكانەی كە بە هۆیەوە لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەكانی سەر پردی (صراط)و ئاگری دۆزەخ ڕزگارمان دەبێت

**١. باوەڕهێنان بە خوا، خێر كردن، فەرمان كردن بە چاكەو ڕێگری كردن لە خراپە، یارمەتی دانی كەسی نوقستان و ستەم لێكراو، ئازار نەدانی خەڵكی:**

هاوەڵی بەڕێز أبوذر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرد، چی كارێك بەندە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار دەكات؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((الإيمانُ باللهِ، فَقُلْتُ: يا نَبِيَّ الله مَعَ الإيمان عَمَلٌ؟ قالَ: أنْ تَرْضَخَ مِمّا خَوَّلَكَ اللهُ أو تَرْضَخَ مِمّا رَزَقَكَ اللهُ، قُلْتُ: يا نَبِيَّ اللهِ، فإنْ كانَ فَقيراً لا يَجِدُ ما يَرْضَخُ؟ قالَ: يَأمُرُ بِالَمعروف وَيَنهى عَنِ الُمنكَرِ، قُلتُ: إنْ كانَ لا يَستَطيعُ أنْ يَأمُرَ بِالَمعروفِ وَلا يَنهى عَنِ الُمنكَرِ؟ قالَ: فَلْيُعِنْ الأخْرَقَ، قُلْتُ: يا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيتَ إنْ كانَ لا يُحْسِنُ أنْ يَصْنَعَ؟ قالَ: فَلْيُعِنْ مَظْلوماً، قُلْت: يا نَبِيَّ اللهِ، أَرَأَيتَ إنْ كانْ ضَعيفاً لا يَستَطيعُ أنْ يُعينَ مَظلوماً؟ قالَ: ما تُريدُ أنْ تَتْرُكَ لِصاحِبِكَ مِنْ خَيرٍ لِيُمْسِكْ أذاهُ عَنِ النّاسِ، قُلْتُ: يا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيتَ إنْ فَعَلَ هذا يَدْخُلُ الجَنَّةَ؟ قالَ: ما مِنْ مُؤمِنٍ يُصيبُ خَصْلَةً مِنْ هذهِ الخِصالِ إلاّ أَخَذَتْ بِيَدِه حَتّى تَدْخُلَهُ الجَنَّةَ)) [٥٦].

واتە: باوەڕ هێنان بە خوای پەروەردگار، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ باوەڕ هێنان بە خوا پەروەردگار كردەوەی چاكە چی هەیە تا بەندە بیكات؟ فەرمووی: ببەخشێت لەوەی كە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە،

---

[٥٦] رواه إبن حِبّان (٣٧٣)، والحاكم (١٣٢/١)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٨٧٦).

ووتم: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەگـەر ئـەو کەسـە هـەژار بـوو هیـچی نـەبوو ببیبەخشێت؟ فەرمووی: با فەرمان بکات بە چاکەو ڕێگری بکات لـە خراپـە، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەو کەسە نەیتوانی فەرمان بکات بە چاکەو ڕێگری بکات لە خراپە؟ فـەرمووی: بـا یارمـەتی کەسێکی نوقـستان (نـەزان) بدات (یارمەتی کەسێك بدات کە ناتوانێت یـان نازانێـت ئیشێك بکـات)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نەیتوانی بـە باشـی و بـە چـاکی یارمـەتی خـەڵکی بدات، چی بکات باشە؟ (واتـە: هـیچ کـارێکی نـەدەزانی تـا یارمـەتی خـەڵکی بدات)، فەرمووی: بـا یارمـەتی سـتەم لێکراوێـك بـدات، ووتم: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەگەر کەسێکی بێتوانا بـوو نەیـدەتوانی یارمـەتی ئـەو سـتەم لێکـراوە بـداتێ فـەرمووی: یارمـەتی هاوڕێکـەت بـدە تـا دەسـت لـە زوڵـم و سـتەم بگرێتەوە، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر کەسێك ئـەم کارانـە بکـات ئایـا دەچـێتە بەهەشـتەوە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: هـیچ بەندەیـەکی موسڵمان نییە یەکێك لەم کارانە بکات، ئیللا ئەو کارە چاکە دەستی دەگرێت تا دەیکاتە ناو بەهەشتەوە.

### ٢. جێبەکردنی پێداویستی خەڵکی و لابردنی ناڕەحەتی لەسەریان:

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی ئیمامی عُمَر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أَحَبُّ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ أَنْفَعَهُمْ لِلنَّاسِ، وَأَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ سُرُورٍ تُدْخِلُهُ عَلَى مُسْلِمٍ، أَوْ تَكْشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً، أَوْ تَقْضِي عَنْهُ دِينًا، أَوْ تُطْرَدُ عَنْهُ جُوعًا، وَلأَنْ أَمْشِيَ مَعَ أَخٍ لِي فِي حَاجَةٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ، يَعْنِي "مَسْجِد الْمَدِينَةِ" شَهْرًا، وَمَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ

اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ كَظَمَ غَيْظَهُ وَلَوْ شَاءَ أَنْ يُمْضِيَهُ أَمْضَاهُ، مَلأَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَلْبَهُ أَمْنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ مَشَى مَعَ أَخِيهِ فِي حَاجَةٍ حَتَّى أَثْبَتَهَا لَهُ، أَثْبَتَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدَمَهُ عَلَى الصِّرَاطِ يَوْمَ تَزِلُّ فِيهِ الأَقْدَامُ، وإنَّ سُوءَ الخُلُق لَيُفْسِدُ العَمَلَ كَما يُفْسِدُ الخَلُّ العَسَلَ)) [٥٧].

واته: خۆشەویستترین بەندە بەلای خوای پەروەردگارەوە ئەو بەندەیەیە (موسڵمانەیە) کە زۆر بە کەڵك و بەسوودە بۆ بەندەکان، وە خۆشەویستترین کردەوە بەلای خوای پەروەردگارەوە ئەوەیە: خۆشییەك بخەیتە دڵی موسڵمانێکەوە، یان ناخۆشی و ناڕەحەتییەکی لەسەر لابەریت، یان قەرزێکی بۆ بدەیتەوە، یان نانی پێبدەیت و لە برسێتییەك تێری بکەیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لەگەڵ برایەکی موسڵمانمدا بڕۆم بۆ جێبەجێ کردنی کارو پێویستییەکی، ئەوە بەلامەوە خێرترو خۆشەویستترە، وەك لەوەی یەك مانگ لە مزگەوتی خۆما بمێنمەوەو عیبادەتی خوای پەروەردگار بکەم (عیبادەتی سوننەت، نەك فەرز)، وە هەرکەسێك تووڕەیی خۆی بگرێتەوە ئەوە خوای پەروەردگار عەیب و کەم و کوڕییەکانی دەپۆشێت، وە هەرکەسێك ڕق و کینەی خۆی بخواتەوە لە کاتێکدا ئەگەر ویستی لێبوایە ڕقەکەی جێبەجێ دەکرد، ئەوە خوای پەروەردگار لە دواڕۆژدا دڵی پڕ دەکات لە هێمنی و ئارامی (ترس و دڵە ڕاوکێی لەسەر لا دەبات)، وە هەر موسڵمانێك لەگەڵ برایەکی موسڵمانیدا بڕوات بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی پێویستی تا پێویستییەکەی تەواو دەکات و تەواو پێیەکانی جێگیر دەبێت

---

[٥٧] حسنه الألباني في "صحيح الجامع" (١٧٦).

تیایدا، ئەوە خوای پەروەردگار پێیەکانی جێگیر دەکات لەسەر پردی (صِراط) لەو ڕۆژەی کە پێیەکان هەڵدەخلیسکێن و خۆیان ناگرن بەسەر پردی (صِراط)ـەوە، وە ڕەوشتی ناشرین کردەوەی چاکە تێك دەدات و خراپی دەکات، هەروەك چۆن سرکە هەنگوین تێك دەدەات و خراپی دەکات.

### ٣. کردنی ئەو کارانەی کە دەبێتە مایەی بەدەست هێنانی شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ):

گرنگی دان بەو کارانەی کە دەبێتە مایەی بەدەست هێنانی شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی لاچوون و سووك بوونی ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِـراط)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر پردی (صِراط) ڕادەوەستێت و بەردەوام دەپاڕێتەوەو داوا لە خوای پەروەردگار دەکات تا ئیمانداران بەسەلامەتی ڕزگار بکات و بەرنەبنەوە ناو دۆزەخ، بەردەوام دەپاڕێتەوەو دەڵێت: (رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ): ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە، ئەی پەروەردگار سەلامەتیان بکە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە لەسەر پردی (صِراط) شەفاعەت بۆ کۆمەڵە موسڵمانێك دەکات، لە کاتێکدا دەبینێت موسڵمانان لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکی زۆردان.

هاوەڵی بەڕێز أنسِ کوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((سألتُ النَّبيَّ (ﷺ) أَنْ يَشْفَعَ لِي يَومَ القيامَة، فَقالَ: (أنا فاعلٌ)، قالَ: قُلْتُ: يا رَسولَ الله فَأينَ أَطْلُبكَ؟ قالَ: أُطْلُبْني أولَّ ما تَطْلُبُني عَلى الصِّراط، قالَ: قُلتُ: فإنْ لَم أَلْقكَ على الصِّراطِ؟ قالَ: فَاطْلُبْنِي عِندَ المِيزانِ، قُلْتُ: فإنْ لَم أَلقكَ عِندَ المِيزانِ؟ قالَ:

فَاطْلُبْني عِندَ الحَوضِ فإنّي لا أُخْطِئُ هذه الثَّلاث المَواطِن))[٥٨].

واتە: داوام لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە لە ڕۆژی دواییدا شەفاعەتم بۆ بکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ شەفاعەتت بۆ دەکەم، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لە کوێ پێت بگەم و بتبینم تا شەفاعەتم بۆ بکەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەیەکەم ساتەوە بە دواما بگەڕێ و هەوڵ بدە بمبینە لەسەر پردی (صِراط)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێت نەگەیشتم و نەتم بینی لەسەر پردی (صِراط)، فەرمووی: بە دواما بگەڕێ و هەوڵ بدە بمبینە لای ترازوو (لە کاتی کێشانی کردەوەکان)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر پێت نەگەیشتم و نەتم بینی لای ترازوو؟ فەرمووی: هەوڵ بدە لای حەوزی (کَوثر) بمبینە، چونکە من هەرگیز ئەو سێ شوێنە جێ ناهێڵم، بەڵکو بەردەوام لەو شوێنانەم.

بۆیە هەر موسڵمانێك حەزدەکات و دەیەوێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەفاعەتی بۆ بکات تا ڕزگاری بێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دواڕۆژ بە گشتی و ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط) بە تایبەتی، ئەوە با گرنگی بە کردنی کردەوە چاکەکان بدات بە گشتی و ئەو کارانەی کە دەبێتە مایەی بەدەست هێنانی شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەتی.

---

[٥٨] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٣٢/٢٤)، والترمذي (٢٤٣٣)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٣٦٢٥).

**گرنگترین ئەو کارە چاکانەی کە شەفاعەتی پێغەمبەری (ﷺ) پێبەدەست دێت، ئەمانەن:**

**یەکەم: داواکردنی (الوَسيلَة)[59] بۆ پێغەمبەر (ﷺ):**

عَبدالله کوڕی ئیمامی عَبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... سَلُوا اللهَ لِيَ الوَسِيلَةَ فَإنَّهُ لا يَسْأَلُهَا لِي عَبْدٌ فِي الدُّنيا إلاّ كُنْتُ لَهُ شَهِيدَاً أو شَفِيعَاً يَومَ القِيامَةِ))[60].

واتە: دوای ئەوەی وەڵامی بانگ بێژتان دایەوە داوای وسیلەم بۆ بکەن (داوای ئەو شوێن و پلە بەرزەی بەهەشتم بۆ بکەن)، چونکە هیچ بەندەیەکی موسڵمان لە دونیادا داوای ناکات بۆم، ئیللا لە دوارۆژدا شایەتی بۆ دەدەم کە شایستەی بەهەشتە، یان شەفاعەتی بۆ دەکەم تا نەچێتە دۆزەخەوە ئەگەر شایستەی چوونە ناو دۆزەخیش بێت[61].

داواکردنی ئەو شوێن و پلە بەرزەی بەهەشت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای بیستن و وەڵام دانەوەی بانگی پیرۆز دەبێت، هەروەك هاوەڵی بەڕێز جابر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَّهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ

---

[59] (الوَسيلَة): بەرزترین پلەو مەنزلگایە لە بەهەشتدا، بۆ هیچ کەس نابێت جگە لە بەندەیەك لە بەندەکانی خوا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئومێدم وایە ئەو کەسە من بم.

[60] رواه الطبراني في "المعجم الأوسط" (١/١٩٨/٦٣٣)، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٣٦٣٧).

[61] بڕوانە: التيسير بشرح الجامع الصغير، للإمام الحافظ زين الدّين عبد الرؤوف المناوي (٢/١١٨).

الْقِيَامَةِ)) [٦٢].

واتە: هەر موسڵمانێك كاتێك گوێی لە بانگ بوو وەڵامی دایەوەو پاشان ووتی: ((اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

واتە: ئەی خوایە، پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوو نوێژە دامەزراوە، ببەخشە بە پێغەمبەرمان (ﷺ) پلەی بەرزی (الوَسِيلَة)، وە (الفَضِيلة) كە پلەیەكی زیادەیە بەسەر دروست كراواندا، وە بیبەرە ئەو شوێنە سوپاس كراوەی كە بەڵێنت پێداوە (ئەویش پلەی شەفاعەتی گەورەیە لە دواڕۆژدا) ئەوە لە دواڕۆژدا شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێت.

**دووەم: زۆر صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ):**

پێغەمبەر (ﷺ) هانی داوین تا صەلاواتی زۆر لەسەر بدەین، وە هەواڵی داوە نزیكترین موسڵمان لێیەوە، یان نزیكترین موسڵمان كە بەر شەفاعەتی بكەوێت ئەو موسڵمانەیە كە زۆر سەلاواتی لەسەر دەدات، هەروەك هاوەڵی بەڕێز عَبدالله كوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلاةً)) [٦٣].

---

[٦٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٣١/٣)، والبخاري (٦١٤)، ومسلم (٣٨٤)، والترمذي (٢١١)، وأبو داود (٥٢٩)، والنسائي (٦٧٨)، وإبن ماجه (٧٢٢).

[٦٣] رواه الترمذي (٤٨٤)، وإبن حبان (٩١١)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن لغيره (١٦٦٨).

واتە: نزیکترین موسڵمان لە منەوە، یان نزیکترین موسڵمان کە بەر شەفاعەتی من بکەوێت، ئەو موسڵمانەیە کە زۆر صەلاواتی لەسەر من داوە، لە هەموو موسڵمانان زیاتر سەلاواتی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) داوە.

**سێیەم: صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بە ژمارەی دیاری کراو:**

هاوەڵی بەڕێز أبوالدَّرداء (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ صَلَّى عَلَيَّ حِينَ يُصْبِحُ عَشْرَاً، وَحِينَ يُمْسِي عَشْرَاً، أَدْرَكَتْهُ شَفَاعَتِي يَومَ القِيامَةِ)) [٦٤].

واتە: هەر موسڵمانێك کاتێك بەیانی دەکاتەوە دەجار صەلاوات لەسەر من بڵێت، وە کاتێك ئێوارەشی بەسەرداهات بەهەمان شێوە دەجار صەلاوات لەسەر من بڵێت *، ئەوە لە دوارۆژدا شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێت.

هەروەها هاوەڵی بەڕێز رافِع کوڕی ثابت (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَقَالَ: اللَّهُمَّ أَنْزِلْهُ الْمَقْعَدَ الْمُقَرَّبَ عِنْدَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَجَبَتْ لَهُ شَفَاعَتِي)) [٦٥].

---

[٦٤] رواه الطبراني، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٣٥٧).

* ئەم سەلاوات دانە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بەشێکە لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران، دوای نوێژی بەیانی تا خۆر کەوتن و دوای نوێژی عەسریش تا خۆر ئاوا بوون دەخوێندرێت، وە باشترین شێوازی سەلاواتیش ئەم شێوازەیە: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ).

[٦٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/٣١١)، والطبراني في "الكبير" واللفظ له (٤٤٨٠)، وحسنه الهيثمي في "مجمع الزوائد" (١٠/١٦٣)، والسيوطي في "البدور السافرة في أمور الآخرة" (١١٠٨)، ووافقه

واتە: هەر موسڵمانێك سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات و بڵێت: (اللَّهُمَّ أَنْزِلْهُ الْمَقْعَدَ الْمُقَرَّبَ عِنْدَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ): ئەی پەروەردگار پێغەمبەر (ﷺ) لە شوێن و مەنزڵگایەکی نزیك خۆت دابنێ لە دوارِۆژ، ئەگەر ئەم دوعایەی کرد ئەوە لە دوارۆژدا شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێت.

**چوارەم: زۆر کردنی نوێژی سوننەت:**

زیادِ کوڕی أبوزیاد (خوای لێ ڕازی بێت) لە خزمەتکارێکی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموو: ئایا پێویستیەکت هەیە تا بۆت جێبەجێ بکەم: زیاد دەفەرمووێت: ئەوە بوو ڕۆژێکیان خزمەتکارێکی وتی: پێویستیم پێتە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پێویستیەکەت چییە تا بۆت جێبەجێبکەم؟ وتی: پێویستیم پێت ئەوەیە لە دوارۆژدا شەفاعەتم بۆ بکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کێ ئەمەی پێ وتی (کێ ڕێنمونی کردی بۆ ئەم داوایە)؟ ئەویش وتی: خوای پەروەردگار خستێ دڵمەوە تا داوای ئەو کارەت لێ بکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەی ئەگەر تۆ هەر سووری لەسەر ئەو داوایەت ئەوە: ((فَأَعِنِّي بِكَثْرَةِ السُّجُودِ))[٦٦]، واتە:

---

الوادعي في كتاب الشفاعة وقال: لكن الحديث له شواهد يرتقي بها إلى الحسن. أهـ (ص ٢٣٥)، وقال الساعاتي في الفتح: رواه البزار والطبراني في الكبير والأوسط، وقال المنذري: وبعض أسانيدهم حسن اهـ (٣١١/١٤)، **بەڵام شێخ ئەلبانی دەڵێت: فەرموودەیەکی** (ضَعيفَ)**ـە، هەروەك لە کیتابی** (تخريج كتاب السُنة لأبي عاصم) **لاپەڕە (٨٢٧) هاتووە.**

[٦٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢١٩/٢) و(١٣٢/٢٤)، وصححه الألباني في "السلسلة الصحيحة" (٢١٠٢).

یارمەتی دەرم بە بۆ هاتنەدی ئاواتەکەت ئەویش بەوەی سوجدەی زۆر بەری بۆ خوای پەروەردگار.

موسوڵمانی نوێژخوێنی خۆشەویست جوان وورد بەوە لە فەرموودەکە ئەو کاتە گەورەیی نوێژە سوننەتەکانت بۆ دەردەکەوێت، لە کاتێکدا ئەو هاوەڵە بەرێزەی پێغەمبەر (ﷺ) داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر (ﷺ ) دەکات، پێغەمبەریش (ﷺ ) ڕێنمونی دەکات بۆ زیاد کردنی نوێژی سوننەت، چونکە سوجدە بردن بەتەنها هیچ مانایەکی نییە"مەگەر بۆ چەند حاڵەتێك نەبێت" وە نوێژە فەرزەکان هەر دەبێت ئەنجام بدرێت، بۆیە لێرەدا مەبەست بە (فَأَعِنِّي بِكَثْرَةِ السُّجُودِ) نوێژە سوننەتەکانە نەك بردنی سوجدە بە تەنها.

## پێنجەم: ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی و ناڕەحەتی ژیان لە شاری مەدینەی پیرۆز:

هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يَصْبِرُ عَلَى لَأْوَاءِ الْمَدِينَةِ وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ إِلا كُنْتُ لَهُ شَهِيدًا أَوْ شَفِيعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) [٦٧].

واتە: هیچ موسڵمانێك ئارام ناگرێت لەسەر نەبوونی و ناڕەحەتی ژیانی شاری مەدینەی پیرۆز (یان هەر ناخۆشی و ناڕەحەتییەکی تر) ئیللا لە دوارۆژدا شایەتی بۆ دەدەم کە شایستەی بەهەشتە، یان شەفاعەتی بۆ دەکەم تا نەچێتە دۆزەخەوە ئەگەر شایستەی چونە دۆزەخیش بێت [٦٨].

زانای پایەبەرز ئیمامی الباجي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: (اللأْوَاء):

---

[٦٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٣/٢٦٠)، ومسلم (١٣٧٨)، والترمذي (٣٩٢٤).

[٦٨] بڕوانە: التيسير بشرح الجامع الصغير، للإمام الحافظ زين الدين عبد الرؤوف المناوي (٢/١١٨).

مەبەست پێی برسێتی و بێ کاری و ناڕەحەتی ژیانە، و(الـشِّدَّة): مەبەست پێی هەموو کارێکە کە ناخۆشی و ناڕەحەتی بە دانیشتوانی شاری مەدینەی پیرۆز بگەیەنێت [٦٩].

**شەشەم: مردنی موسڵمان لە شاری مەدینەی پیرۆز:**

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی ئیمامی عُمَر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا، فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا)) [٧٠].

واتە: هەر موسڵمانێك دەتوانێت لە شاری مەدینە بمرێت، با هەوڵ بدات لەوێ بمرێت (واتە: دەرنەچێت و شاری مەدینە جێنەهێڵێت ئەگەر خەڵکی ئەوێیە)، چونکە من لە دوارۆژدا شەفاعەت بۆ ئەو موسڵمانە دەکەم کە لە شاری مەدینەی پیرۆز مردووە.

**٤. ئارامگرتن لەسەر مردنی منداڵ:**

هاوەڵی بەڕێز عَبدُالرحمنِ کوڕی بَشیر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ ماتَ لَهُ ثَلاثَةٌ مِنَ الوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ لَمْ يَرِدِ النّارَ إلاّ عابِرِ سَبِيْلٍ "يَعني الجَواز عَلى الصِّراطِ")) [٧١].

---

[٦٩] بڕوانە: المنتقى شرح موطأ مالك (١٦٣٨).

[٧٠] رواه الإمام أحمد"الفتح الرباني" (٢٣/٢٥٩)، والترمذي (٣٩١٧)، وابن ماجه (٣١١٢)، وصححه السيوطي في "الجامع الصغير" (٨٤٠٤)، ووافقه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٠١٥).

[٧١] رواه الطبراني، وحسنه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٢٠٠١).

واتە: هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێت کە نەگەیشتبێتنە تەمەنی باڵغ بوون (پاك بن و تاوانیان نەکردبێت)، ئەوە ئەو موسڵمانە ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە مەگەر بە وێنەی تێپەڕبوونی گەشتیارێك بە ڕێگایەکدا، واتە: بەسەر پردی (صِراط)دا تێدەپەڕێت و ناچێتە دۆزەخەوە.

وە هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ يَمُوتُ لأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَتَمَسَّهُ النَّــارُ إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ)) [72].

واتە: هیچ موسڵمانێك سێ منداڵی نامرێت ئیللا بەدوور دەبێت و ناچێتە دۆزەخەوە، مەگەر ئەوەندە کە خوای پەروەردگار سوێندی خواردووە کە دەبێت بەندەکان بە ناویدا بڕۆن، ڕۆیشتنی موسڵمان بەناو ئاگری دۆزەخدا بریتییە لە ڕۆیشتن بەسەر پردی (صِــراط)دا نەك چوونە ناوی، واتە: ئەو موسڵمانەی کە سێ منداڵی دەمرێت پێش باڵغ بوونیان ئەوە تەنها بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات نەك بە ناو ئاگری دۆزەخدا.

هەروەها فەرموودەیەکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: جارێکیان ئافرەتێك منداڵێکی نەخۆشی بە باوەشەوە بوو هات بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ)، ووتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەترسم ئەمەشیان بمرێت، چونکە سێ منداڵی ترم پێش ئەم مردووە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((لَقَدِ احْتَظَرْتِ بِحِظَـــارٍ شَدِيدٍ مِنَ النَّارِ)) [73].

---

[72] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٣٨/١٩)، والبخاري (٦٦٥٦)، ومسلم (٢٦٣٢)، والترمذي (١٠٦٠)، والنسائي (١٨٧٥)، وابن ماجه (١٦٠٣).

[73] رواه النسائي (١٨٧٧)، والبخاري في "الأدب المفرد" (١٤٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب"

واتە: بەڕاستی تۆ پارێزراوی لە ئاگری دۆزەخ بە بەربەستێکی زۆر بەهێزو پتەو، بەربەستێکی زۆر پتەو لە نێوان تۆو دۆزەخدا هەیە.

هاوەڵی بەڕێز أبوسَعيد الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ ثَلاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلاَّ كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ. فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَيْنِ، فَقَالَ: وَاثْنَيْنِ )) [٧٤].

واتە: هیچ ئافرەتێکی موسڵمان نییە لە ئێوە کە سێ منداڵی دەمرێت، ئیللا بۆی دەبنە پەردەو ناوەندێك لە ئاگری دۆزەخ، ئافرەتێك ووتی: ئەگەر دوو منداڵیشی بمرێت هەر بۆی دەبنە بەربەستێك لە ئاگری دۆزەخ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ ئەگەر دوو منداڵیشی بمرێت هەر بۆی دەبنە بەربەستێت لە ئاگری دۆزەخ.

**٥. بەردەوام بوون لەسەر کردنی نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر:**

هاوەڵی بەڕێز عُمَارَة کوڕی رُوَيْبَة الثَّقَفِيٌّ لە باوکییەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((لَنْ يَلِجَ النَّارَ مَنْ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا)) [٧٥].

---

.(١٩٩٤)

[٧٤] رواه الإمام مالك (٥٥٤)، وأحمد "الفتح الرباني" (١٩/١٣٨)، والبخاري (١٠٢)، ومسلم (٢٦٣٤)، والترمذي (١٠٦٠)، والنسائي في "الكبرى" (٣/٤٥٢، رقم ٥٨٩٧)، وابن ماجه (١٦٠٣)، وعبد بن حميد (ص ٢٨٧ ، رقم ٩١٦)، وابن حبان (٧/٢٠٦، رقم ٢٩٤٤)، وأبو يعلى (٢/٤٦١، رقم ١٢٧٩)، والبغوى في "الجعديات" (١/١٠٣، رقم ٦٠٨)، والبيهقى (٤/٦٧، رقم ٦٩٢٨) .

واتە: هیچ موسڵمانێك ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە ئەگەر پێش خۆر هەڵات و پێش خۆر ئاوابوون نوێژ بكات، واتە: نوێژی فەرزی بەیانی و عەسر بكات.

### ٦. بەردەوام بوون لەسەر كردنی نوێژی چێشتەنگاو (صَلاةُ الضُحی):

موسڵمان داوای لێكراوە كە هەموو ڕۆژێك سێسەدو شەست خێرو چاكە بكات، هەر موسڵمانێك ئەو خێرانە بكات و لەو ڕۆژەدا بمرێت ئەوە خۆی دڵنیا كردووەو خۆی پاراستووە لە ئاگری دۆزەخ لەو كاتەی كە بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات بە پشتیوانی خوای پەروەردگار، دایكی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمَائَةِ مَفْصِلٍ، فَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ، وَحَمِدَ اللَّهَ، وَهَلَّلَ اللَّهَ، وَسَبَّحَ اللَّهَ، وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ، وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ، عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلاَثِمائَةِ السُّلاَمَى فَإِنَّهُ يَمْشِي، وفي روايةٍ " يُمْسِي" يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ)) [٧٦].

---

[٧٥] أخرجه أحمد (١٣٦/٤، رقم ١٧٢٥٩)، وأبو داود (١١٦/١، رقم ٤٢٧)، ومسلم (٤٤٠/١، رقم ٦٣٤)، والنسائى (٢٣٥/١، رقم ٤٧١)، وابن حبان (٣٤/٥، رقم ١٧٤٠). وأخرجه أيضًا: ابن خزيمة (١٦٤/١، رقم ٣١٩).

[٧٦] أخرجه مسلم (٦٩٨/٢، رقم ١٠٠٧)، وأبو الشيخ فى "العظمة" (١٦٢٠/٥، رقم ١٠٦٦٢)، وأخرجه أيضًا: النسائى فى "الكبرى" (٢٠٩/٦، رقم ١٠٦٧٣)، وابن حبان (١٧٣/٨، رقم ٣٣٨٠)، والبيهقي (١٨٨/٤، رقم ٧٦١١).

واته: هەر مرۆڤێك لە نەوەی ئادەم (الطَّيْلاَ) وا دروست كراوە كە سێسەدو شەست جومگەی هەیە، بۆیە هەر موسڵمانێك "الله أكبر"ێك، یان"الحمدلله"یەك، یان "لآ إلـهَ إلا الله"،یەك، یان"سبحان الله"یەك، یان"أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ"یەك بكات، بەردێك یان درِكێك یان ئێسكێك (نارِەحەتییەك) لەسەر رِێی موسڵمانان لابەرێت، وە فەرمان بە چاكە بكات، وە نەهی و رِێگری لە خراپە بكات، بە ئەندازەی ئەو سێسەدو شەست جومگەیە چاكە بكات، ئەوە ئەو موسڵمانە بەسەر زەویدا دەرِوات و نەفسی خۆی لە ئاگری دۆزەخ رِزگار كردووە، یان كاتێك ئێوارەی بەسەردا دێت ئەوە نەفسی خۆی لە ئاگری دۆزەخ رِزگار كردووە، بە كردنی ئەو كردەوانەو كردەوە چاكەكانی تر.

موسڵمانی خۆشەویست پێ دەچێت كردنی ئەو هەموو كردەوە چاكانە لە رِۆژێكدا كارێكی هەروا ئاسان نەبێت، دەی با بزانین چی كارێك شوێنی ئەو هەموو چاكەیەمان بۆ دەگرێتەوە لە رِۆژێكدا تا ئێمەش ئەنجامی بدەین؟ بەڵێ ئەوەی شوێنی ئەو هەموو چاكەیەمان بۆ بگرێتەوە لە رِۆژێكدا كردنی دوو رِكات نوێژی چێشتەنگاوە (صَلاةُ الضُّحى)، هەروەك هاوەڵی بەرِێز أبوذر (خوای لێ رِازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنْ الضُّحَى)) [٧٧].

---

[٧٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٥/٢٢)، ومسلم (١/٤٩٨ رقم ٧٢٠)، وأبو داود (١٢٨٥) والنسائي

واتە: کاتێك ڕۆژ دەبێتە هەر یەك لە جومگەکانتان (ئەی موسڵمانان) خێرو صەدەقەی دەکەوێتە سەر کە دەبێت بیان کات، بۆیە ووتنی هەر "سبحان الله"یەك خێرێکە، وە ووتنی هەر "الحمدلله"یەك خێرێکە، وە ووتنی هەر "لآ إلـهَ إلا الله"،یەك خێرێکە، وە ووتنی هەر "الله أکبر"ێك خێرێکە، وە فەرمان کردن بە چاکە خێرێکە، وە نەهی و ڕێگری کردن لە خراپە خێرێکە، وە ئەوەی شوێنی ئەم هەموو خێرو چاکەیە بگرێتەوە تەنها کردنی دوو ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوە*.

هاوەڵی بەڕێز أبوبُرَیدة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((فِي الإِنْسَانِ ثَلاَثُمائَةٍ وَسِتُّونَ مَفْصِلاً فَعَلَيْهِ أَنْ يَتَصَدَّقَ عَنْ كُلِّ مَفْصِلٍ مِنْهُ بِصَدَقَةٍ. قَالُوا: وَمَنْ يُطِيقُ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: النُّخَاعَةُ فِي الْمَسْجِدِ تَدْفِنُهَا، وَالشَّيْءُ تُنَحِّيهِ عَنِ الطَّرِيقِ، فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فَرَكْعَتَا الضُّحَى تُجْزِئُكَ))[٧٨].

---

في الكبرى (٥/٣٢٦ رقم ٩٠٢٨)، وابن خزيمة (٢/٢٢٨، رقم ١٢٢٥).

* موسڵمانی خۆشەویست خۆ ئەگەر بتوانیت ڕۆژانە چوار ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو بکەیت، ئەوە خۆت بێخەم دەکەیت لە بەڕێوەبردنی کارو بارەکانی دوای نیوەڕۆ و دەمەو ئێوارەت، هەروەك خوای پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێت: ((إبن آدم لا تعجزني من أربع ركعات في أول النهار أكفك آخره)). رواه أبو داود (١٢٨٩) والدارمي (١/ ٣٣٨) وأحمد (٥/ ٢٨٦ و ٢٨٧)، واتە: ئەی بەندەی موسڵمان بێدەسەلات و بێ تاقەت مەبە لە کردنی چوار ڕکات نوێژ لەسەرەتای ڕۆژەوە (واتە: نوێژی چێشتەنگاو)، ئەگەر ئەو چوار ڕکات نوێژەت کرد ئەوە خەمت نەبێت من کارەکانی کۆتایی ڕۆژت بۆ ئاسان دەکەم و بۆت بەڕێوە دەبەم و دەتپارێزم.

[٧٨] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٩/١٧٦)، وأبو داود واللفظ له (٥٢٤٢)، والطحاوي في (مشكل

واتە: لە مرۆڤدا سێسەدو شەست جومگە هەیە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ بۆ هەر جومگەیەك لە ڕۆژێکدا خێرو صەدەقەیەك بکات، هاوەڵانی بەڕێز (خوایان لێ ڕازی بێت) وتیان: کێ دەتوانێت لە ڕۆژێکدا بۆ هەر جومگەیەکی لاشەی خێرو چاکەیەك بکات؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پاککردنەوەی تف (یان هەر پیسیەك)ی ناو مزگەوت خێرو چاکەیە، وە شتێك کە بۆتە مایەی ناڕەحەتی موسڵمانان لەسەر ڕێگاویان لادانی خێرو چاکەیە، ئەگەر ئەمانەت نەبینی یان پێت نەکرا ئەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو بکە، شوێنی ئەو هەموو خێرو چاکەیەت بۆ دەگرێتەوە.

موسڵمانی خۆشەویست زۆر جێگای داخ و خەفەتە بێئاگا بوونمان لە کردنی ئەو دوو ڕکاتە نوێژە سوننەتە، خۆ ئەگەر ڕۆژێك نەمان توانی بیکەین بە هۆی ئیش وکارو سەرقاڵیمان بە ژیانی دونیاوە، ئەوە با هەوڵ بدەین زمانمان بخەینە گەڕو زیکرو یادی خوای پەروەردگاری پێبکەین و زۆر بڵێین: "سبحان الله" وَ "الحمدلله" وَ "لآ إلـهَ إلا الله" وَ "الله أكبر"، وە سەرجەم ویردەکانی ترو کارە چاکەکانی تر بکەین بە ئەندازەی ئەو ژمارەیەی کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، کە دەتوانین بە چەند دەقیقەیەکی کەم ئەنجامی بدەین بە پشتیوانی خوای پەروەردگار، وە بۆ ئەوەی ئەندامەکانی لاشەمان ڕزگار بکەین لەو قەرزەی کە ڕۆژانە دەکەوێتە سەریان.

---

الآثار) (١/ ٢٥) وابن حبان (٦٣٣ و ٨١١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٤٢٣٩).

### ٧. بەردەوام بوون لەسەر کردنی چوار ڕکات نوێژی سوننەت لە پێش نوێژی نیوەڕۆو چوار ڕکات لە دوای:

دایکی ئیمانداران أُمُّ حَبِيبَة (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ حافَظَ على أَرْبَعِ رَكَعاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرُمَ عَلَى النَّارِ)) [٧٩].

واتە: هەر موسڵمانێك بەردەوام چوار ڕکات نوێژی سوننەت پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکات لە دوای بکات، ئەوە خوای گەورە بەدوری دەگرێت و دەیپارێزێت لەئاگری دۆزەخ.

وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ يُصَلِّي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ بَعْدَ الظُّهْرِ فَتَمَسُّ وَجْهَهُ النَّارُ أَبَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ)) [٨٠].

واتە: هەر بەندەیەکی موسڵمان چوار ڕکات نوێژی سوننەت دوای نوێژی نیوەڕۆ بکات، ئەوە ڕووی ئەو موسڵمانە پارێزراوەو هەرگیز ئاگری دۆزەخ نایگرێت (إن شآء الله).

زانای پایەبەرز أبو الطيب مُحَمَّد شَمسُ الدّين آبادي (ڕەحمەتی خوای لێبێت)

---

[٧٩] رواه الترمذي(٢١٥/٢/٣٩٢)، والنسائي(٣٤١/٦/١٧٩٢)، وابن ماجه(٤٩٠/٣/١١٥٠)، وأحمد(٢١٢/٥٤/٢٥٥٤٧)، وإبن أبي شيبة في "مصنفه"(١٠٩/٢)، والطبراني في"معجم الكبير"(٦٨/١٧)، وأبو يعلى في "مسنده"(٤١٨/١٤/٦٩٧٣)، وإبن خزيمة في"صحيحه"(٤٠٤/٤/١١٢٧).

[٨٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٤/٢٠٠)، والترمذي (٤٢٨)، والنسائي (١٨١٦)، وأبو داود (١٢٦٩)، وإبن ماجه (١١٦٠)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦١٩٥).

له شەرحی ئەم فەرموودە پیرۆزەدا دەڵێت: ووتەی پێغەمبەر (ﷺ): (حَـرُمَ عَلَى النَّــارِ): واتـە: خـوای پـەروەردگار ئـەو بەندەیـە دەپارێزێـت لـە ئـاگری دۆزەخ، هەروەك لە فەرموودەیەكی تردا دەفـەرمووێت: (حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ)، وە لە لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرمووێت: (حَرَّمَ اللهُ لَحْمَهُ عَلَى النَّارِ)، واتـە: خوای پەروەردگار لاشەی ئەو موسڵمانە دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، لێرەدا ڕاجیایی هەیە لە لێكدانـەوەی فەرموودەكـە: ئایا ئـەو موسـڵمانەی كـە چـوار ڕكات نوێژی سوننەت پێش و دوای نوێـژی نیـوەڕۆ بكـات هـەر لـە بنەڕەتـداو هەرگیز ناچێتە دۆزەخەوە؟ یان ئەگەر بچێتە دۆزەخیشەوە ئەوە ئاگر لاشەی ناسووتێنێت؟ یان خـوای پـەروەردگار ئـەو موسـڵمانە دەپارێزێـت و ناهێڵێـت لاشەی بە گشتی بسووتێت ئەگەر هەندێ لە لاشەشی بسووتێت؟ هـەروەك لـە فەرموودەیەكـدا هـاتووە كـە ئیمـامی النَّــــسائي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) ئەیگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (فَتَمَسَّ وَجْهَهُ النَّارُ أَبَــدَاً)، كـە ئەمەش تەواو یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو فەرموودەیـەی كـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرمووێت: (وَحَرَّمَ عَلَى النّارِ أنْ تَأْكُلَ مَواضِــعَ الــسُّجُودِ)، واتـە: خـوای پـەروەردگار حـەرامی كـردووە لەسـەر ئـاگرو ڕێگـەی پێنـەداوە كـە شـوێنی سـوجدەی موسـڵمان بـسووتێنێت و ئـازاری بـدات، لێـرەدا ئـەم فەرموودەیـە گشتگیرە بـەڵام پێدەچێت مەبەسـت پێـی هەنـدێ شـوێنی ئـەو موسـڵمانەی مەبەست بێت كە ئاگری دۆزەخ نایسووتێنێت، بـەڵام بـاش وایـە فەرموودەكـە لەسەر ڕواڵەتەكەی وەربگـرین (حَرُمَ عَلَى النَّارِ)، یـان (حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّــارِ): واتە: خـوای پـەروەردگار ئـەو بەندەیـە دەپارێزێـت لـە ئـاگری دۆزەخ. واتـە: هەموو لاشـەی ئـەو موسـڵمانە پـارێزراوە كـە ئـەو نوێـژە سـوننەتانەی پـێش

نوێـژی نیـوەڕۆ و دوای دەکـات، چـونکە بەخشـشی خـوای پـەروەردگار زۆر فراوانترەو ڕەحم و بەزەیشی زۆر گشتگیرترە، بە هەر حاڵ فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە کردنی چوار ڕکات نوێژی سوننەت پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕکات لە دوای پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ، دەی کەوابوو تەنها ئەوەندە بەسـە بـۆ خێـرو پاداشــت و گـەورەیی ئــەو نوێــژە ســوننەتانە، وە ڕواڵــەتی فەرموودەکـەی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە فەرموویـەتی: (مَـــــنْ صَــــلَّى): ئـەوە دەگەیەنێت ئەگەر موسڵمانێك تەنها یەك جاریش ئەو سوننەتانە بکات ئـەوە هـەر پـارێزراوە لـە ئـاگری دۆزەخ، بـەڵام هـەردوو زانـای پایەبـەرز ئیمـامی الترمذي و أبوداود و جگە لەمانیش (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) بە ڕیوایـەتی (مَنْ حـــافَظَ): واتـە: بەبـەردەوامی بیکـات، گێڕاویانەتـەوە، بۆیـە لێـرەوە ئـەوە دەردەکەوێت دەبێـت ئـەو نوێـژە سـوننەتانە بەبـەردەوامی بکرێـت نـەك یـەك جار، چونکە هیچ موسڵمانێك لە ئاگری دۆزەخ پـارێزراو نابێـت بـە هـۆی ئـەم کردەوەیەوە، ئەگەر جارێك یان چـەند جارێـك بیکـات، بـەڵکو دەبێـت هـەموو ڕۆژێك بەبەردەوامی ئەم نوێژە سـوننەتانە بکـات ئەوسـا پـارێزراو دەبێـت لـە ئاگری دۆزەخ [٨١].

هەربۆیە کاتێك عَنْبَسَة کوڕی أبوسفیان (خوایان لێ ڕازی بێـت) لەسـەرەمەرگدا بوو، نارەحەتی سەرەمەرگی بینی زۆر پەشیمانی دەربڕی، چـونکە بـەردەوام نەبوو لەسەر کردنی چوار ڕکات نوێژی سوننەت لە پێش نوێژی نیوەڕۆو چوار ڕکات لە دوای، پاش ئەوەی خێرو پاداشت و گـەورەیی ئـەم نوێژانـەی بیـست

---

[٨١] بڕوانە: عون المعبود شرح سنن أبي داود لأبي الطيب محمد آبادي (١٤٧/٤).

له أمُّ حَـــبيبَةى خوشكى كه دەكاته خێزانى پێغەمبـەر (ﷺ)، چونكه أم حبيبة (خـواى لـىٚ ڕازى بێـت) كاتێـك فـەزڵ و گـەورەيى ئـەو نوێـژە سـوننەتانەى بـۆ دەركەوت هەتا ئەو ڕۆژەى مرد بەردەوام بوو لەسەر كردنيان.

حَسانِ كوڕى عَطيّة (خواى لىٚ ڕازى بێت) دەفـەرموێت: كاتێـك عَنْبَسَة كـوڕى أبوسفيان (خوايان لىٚ ڕازى بێت) لەسەرەمەرگدا بوو، ئارامى نەماو كەوتە نركـەو ناڵە ناڵ، پێى ووترا: ئەى عَنْبَسَة چييە بۆ وا دەكەيت؟ ئەويش فـەرمووى: لـە أم حبيبـــة خوشـكم بيـست (خـواى لـىٚ ڕازى بێـت) دەيفـەرموو: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويەتى: (مَنْ صَلَّى أَرْبَعَاً قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعاً بَعْدَهَا، حَرَّمَ اللهُ لَحْمَـــهُ عَلَـــى النَّارِ) أم حبيبـــة (خـواى لـىٚ ڕازى بێـت) دەفـەرموێت: لـەو ڕۆژەوەى فـەزڵ و گەورەيى ئەو نوێژانەم بيستووە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) هـەرگيز وازم لێنـەهێناوە بەڵكو بەردەوام كردوومە.

دەى خۆزگـە ئێمـەى موسـڵمانيش بـەردەوام بووينايـە لەسـەر كردنـى ئـەو سوننەتانە و سوننەتەكانى تريش تا ئەو خێرو پاداشتەمان بەدەست بهێنايەو ببوايەتە قەڵغانێك بۆمان و له ئاگرى دۆزەخ ڕزگارمان ببوايە پێى.

## ٨. تـە پوتۆزاوى بـوون و مانـدووبوونى پێيـەكان لـە هـەموو كارێكـدا كـە خـواى پەروەردگار پێى ڕازييە:

هاوەڵى بـەڕێز يَزيد كـوڕى أبـــو مَـــريم (خـواى لـىٚ ڕازى بێـت) دەفـەرموێت: جارێكيان دەچووم بۆ نوێژى هەينى، له ڕێگا عباية كوڕى رفاعة كـوڕى رافـــع (خوايان لىٚ ڕازى بێت) گەيشت پێم و پێى ووتم: موژدەبىٚ لێت ئـەى يَزيـــد ئـەو هەنگاوانەى كـە دەينێيـت و دەڕۆيـت بـۆ مزگـەوت هـەمووى لـە پێنـاو خـواى

پەروەردگاردایە، چونکە گوێم لە أبـــوعبس بـوو دەیفـەرموو: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَمَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ)) [٨٢].

واتە: هەر موسڵمانێك پێیەکانی لە پێناو خوای پەروەردگاردا تـۆزاوی بێـت (جیهاد بکـات)، ئـەوە خـوای پـەروەردگار لاشـەی ئـەو موسـڵمانە لـە ئـاگری دۆزەخ دەپارێزێت.

زانای پایەبەرز ئیمـامی المنـــاوي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) لـە شـەرحی ئـەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (مَـــنِ اغْبَـــرَّتْ قَـــدَمَاهُ)، واتـە: پێیـەکانی خـۆڵاوی و تەپوتۆزاوی بێت کە مەبەسـت پێـی ڕۆیشتنە، (فِي سَـــبِيلِ اللَّـــهِ): واتـە: لـە ڕێیەکـدا پێیـەکانی تـەپوتۆزاوی بێـت و ماندووبێت کـە ڕازی بـوونی خـوای پـەروەردگاری تێدایـە، کـە ئەمـەش ڕێگـای جیهـاد کـردن و گـەڕان بـە دوای زانستی شەرعی و ئامادەبوونی نوێژی جەماعەت و ڕۆیـشتن بـۆ حـەج و جگـە لەم کارەچاکانەش دەگرێتەوە، لەبەر ئـەوەی ووشـەی (سَبِيلِ اللّـــه) نـاوێکی گـشتگیرەو هـــەموو ئـــەو ڕێگایانـــە دەگرێتـــەوە کـــە ڕازی بـــوونی خـــوای پەروەردگاری تێدایە، بەڵام ئەوەی زیاتر لێی تێدەگەین و بەرچـاوە (فِي سَبِيلِ اللَّهِ) جیهاد کردنە، (حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ) خـوای پـەروەردگار هـەموو لاشـەی ئەو بەندەیە دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، کـە ئەمـە ڕەوانـترو بـەهێزترە وەك

---

[٨٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٦٦/٦)، والبخاري (٩٠٧)، والترمذي واللفظ له (١٦٣٢)، والنسائي (٣١١٦)، والدارمي (٢٣٩٧)، و أخرجه الطيالسي (ص ٢٤٣، رقم ١٧٧٢)، قال الهيثمي (٢٨٥/٥): رجاله رجال الصحيح خلا أبي المصبح وهو ثقة، والبيهقي (١٦٢/٩، رقم ١٨٢٩٧)، وإبـــن عـــساكر (٥٧/١٥).

لەوەی بڵێت: (أدخَلَـــهُ اللهُ الجَنَّـــةَ): واتە: خوای پەروەردگار دەیکاتە بەهەشتەوە، چونکە ئەو کەسەی کە پێی دووترێت دەچێتە بەهەشتەوە پێدەچێت دوای چوونە ناو دۆزەخ و سزاکێشان بێت، بەڵام ئەو موسڵمانەی کە پێی دووترێت: (حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَـــى النَّـــارِ): واتە: خوای پەروەردگار بە یەکجاری پاراستوویەتی لە ئاگری دۆزەخ و سزای نادات، موسڵمانی خۆشەویست ئەگەر موسڵمانێك تەنها پێیەکانی تەپوتۆزاوی بێت ئەوە پاداشتی بێت؟!! ئەی ئەو موسڵمانەی کە خۆی بەخت دەکات و دەجەنگێت تا شەهید دەبێت، دەبێت خێرو پاداشتی چەندێ زۆر بێت؟.

هەروەها ئەو فەرموودەیە ئەوەی تێدایە ڕۆیشتن بۆ عیبادەت و خوا پەرستی بە پێ خێرو پاداشتی زۆر زۆرە، وە یەکێکە لەو کارە چاك و بەسوودانەی کە خاوەنەکەی بە هۆیەوە پلەی بەرزی بەهەشت و فیردەوسی پێ بەدەست دێنێت " کە شوێنی هەرە بەرزو خۆشی بەهەشتە" [٨٣].

زانای پایەبەرز المبـــارکفوري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی فەرموودەکەدا دەڵێت: ووتەی پێغەمبەر (ﷺ): (فَهُما حَرامٌ عَلى النّارِ) واتە: ئاگری دۆزەخ نایان گرێت و نایان سووتێن، لەم فەرموودەیەدا ئاماژە بۆ فەزڵ و گەورەیی کارکردن و ماندوو بوون بۆ خوای پەروەردگار کراوە، ئەگەر تەنها پێیەکان تەپوتۆزاوی بێت ئەوە پاداشتی بێت؟ ئەی ئەو موسڵمانەی هەموو هێزو توانای دەخاتە گەڕ بۆ ڕازی بوونی خوای پەروەردگارو هەمووی بۆ ئەو سەرف دەکات، دەبێت خێرو پاداشتی چۆن بێت؟ [٨٤].

---

[٨٣] بڕوانە: فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (٦/٧٦).

[٨٤] بڕوانە: تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للمباركفوري (٥/٢٥٩).

أبو المصبح المقرائي (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: جارێکیان لە زەوی ڕوومەکاندا دەڕۆیشتین لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسڵمانان گەورەو ئەمیرمان مالك کوڕی عَبدُالله الخَثعَمي بوو (خوای لیّ ڕازی بێت)، تێپەڕی بە تەنیشت عبدالله کوڕی جابردا (خوای لیّ ڕازی بێت) کە هێسترێك پێ بوو ڕایدەکێشا، مالك بە جابری ووت: ئەی باوکی عَبدالله خوای پەروەردگار ئەو ئاژەڵە باشەی پێ بەخشیویت بۆ سەرناکەویت؟ جابر (خوای لیّ ڕازی بێت) ووتی: ئاژەڵەکەم چاك و ئامادە دەکەم، بێ پێویست دەبم لە قەومەکەم، چونکە گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی: هەر موسڵمانێك پێیەکانی لە پێناو خوای پەروەردگاردا تۆزاوی بێت (جیهاد بکات)، ئەوە خوای پەروەردگار لاشەی ئەو موسڵمانە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت، مالك (خوای لیّ ڕازی بێت) جابری (خوای لیّ ڕازی بێت) بە جێهێشت و بە دەنگی بەرز بانگی جابری کردوو ووتی: ئەی باوکی عَبدالله خوای پەروەردگار ئەو ئاژەڵە باشەی پێ بەخشیویت بۆ سەرناکەویت؟ جابر (خوای لیّ ڕازی بێت) لە مەبەستی مالك تێگەیشت (واتە: زانی مەبەستی مالك ئەوەیە: هۆکاری سەرنەکەوتنی ئاژەڵەکەی چییە؟ وە خێرو پاداشتی بە پێ ڕۆیشتن بۆ ئەنجامدانی عیبادەت بۆ موسڵمانان ڕوون ببێتەوە)، جابر (خوای لیّ ڕازی بێت) ووتی: ئاژەڵەکەم چاك و ئامادە دەکەم، بێ پێویست دەبم لە قەومەکەم، چونکە گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی: هەر موسڵمانێك پێیەکانی لە پێناو خوای پەروەردگاردا تۆزاوی بێت (جیهاد بکات)، ئەوە خوای پەروەردگار لاشەی ئەو موسڵمانە لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێت، کاتێك موسڵمانان ئەمەیان بیست لە ئاژەڵەکانیان دابەزین و بە پێ ڕۆیشتن، أبو المصبح (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: هیچ

ڕۆژێك نەمبینیوە موسڵمانان ئەوەندە بە زۆری بە پێ بڕۆن[85].

**٩. بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسەی کە غەیبەتی موسڵمانێك دەکات، دیفاع کردن لێی، هیچ شتێکی خراپ نەدەیتە پاڵی لە ناموسی یان هەرشتێکی تری:**

هاوەڵی بەڕێز أبوالدّرداء (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ كَانَ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ)) وفي رواية: ((مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْض أَخِيهِ رَدَّ اللَّه عَنْ وَجْهه النَّار يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[86].

واتە: هەر موسڵمانێك بەرپەرچی کەسێك بداتەوە کە غەیبەتی یان باسی ناموس و کەم و کوڕی موسڵمانێك دەکات، ئەوە ئەو دیفاع کردنەی لەو موسڵمانە دەبێتە بەربەستێك (پەردەیەك) بۆی لە ئاگری دۆزەخ» وە لە فەرموودەکەی تردا دەفەرمووێت: هەر موسڵمانێك بەرپەرچی کەسێك بداتەوە کە غەیبەتی یان باسی ناموس و کەم و کوڕی موسڵمانێك دەکات، ئەوە خوای پەروەردگار ئاگری دۆزەخ لە ڕووی ئەو موسڵمانە دوور دەخاتەوە لە دواڕۆژدا.

وە هاوەڵی بەڕێز سَهلِ کوڕی مُعاذِ کوڕی أنسي الجهني لە باوکییەوە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَنْ حَمَى مُؤْمِنًا مِنْ مُنَافِقٍ يَغْتَابُهُ بَعَثَ اللَّهُ مَلَكًا يَحْمِي لَحْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ

---

(٨٥) رواه إبن حبان (٤٦٠٤)، وأبو يعلى، وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: صحيح لغيره (١٢٧٣).

(٨٦) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٦٩/١٩)، والترمذي (١٩٣١)، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٦٢٦٣).

نَارِ جَهَنَّمَ، وَمَنْ قَفَّا مُسْلِمًا بِشَيْءٍ يُرِيدُ شَيْنَهُ بِهِ حَبَسَهُ اللَّهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ)) [87].

واته: هەر موسڵمانێك بەرگری لە موسڵمانێك بكات و نەهێڵێت دووڕوویەك غەیبەتی بكات و باسی بكات بە خراپە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا فریشتەیەكی بۆ دەنێرێت كە لاشەی ئەو موسڵمانە دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ (چونكە لە دونیادا پارێزگاری لە ناموس و كەسایەتی موسڵمانان كردووە)، وەهەر موسڵمانێك شتێك لە عەیبە و كەم و كوڕی بداتە پاڵ موسڵمانێك و مەبەستی پێی ناشرین كردنی بێت، ئەوە خوای پەروەردگار لەسەر پردی (صِراط) ڕایدەگرێت تا پاك دەبێتەوە لەو تاوانە، ئەویش یان بەڕازی كردنی ئەو كەسەی كە خراپەو عەیبەی داوەت پاڵ، یان بە هۆی شەفاعەت، یان دەبێت بە ئەندازەی تاوانەكەی سزای دۆزەخ بكێشێت.

أسماءِ كچی یَزید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ ذَبَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ بِالْمَغِيبِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَعْتِقَهُ مِنَ النَّارِ)) [88].

---

[87] أخرجه الأمام أحمد (٣/٤٤١، رقم ١٥٦٨٧)، وإبن المبارك (١/٢٣٩، رقم ٦٨٦)، وأبو داود (٤/٢٧٠، رقم ٤٨٨٣)، وإبن أبي الدنيا (ص ١٥١ ، رقم ٢٤٨)، والطبراني (٢٠/١٩٤، رقم ٤٣٣)، وأخرجه أيضًا: البخاري في "التاريخ الكبير" (١/٣٧٧)، وحسنه الألباني في "صحيح أبي داود" (٤٠٨٦).

[88] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٦٢)، أخرجه إبن المبارك (١/٢٣٩، رقم ٦٨٧)، قال الهيثمي (٨/٩٥): إسناده حسن، والطبراني (٢٤/١٧٥، رقم ٤٤٢)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٦/١١٢، رقم ٧٦٤٢)، وأخرجه أيضًا: الطيالسي (ص ٢٢٧ رقم ١٦٣٢) وعبد بن حميد (ص ٤٥٦ رقم ١٥٧٩)،

واتە: هەر موسڵمانێك بەرگری لە ناموس و لاشەی موسڵمانێك بكات لە پاشملە، ئەوە بێگومان خوای پەروەردگار پێویستی كردووە لەسەر خۆی كە ڕزگاری بكات لە ئاگری دۆزەخ.

هەر كەسێك ڕابگیرێت و ڕۆیشتنی هێواش و خاو بێت لەسەر پردی (صِراط) ئەوە گرووتینی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت و دەیسووتێنێت (خوا پەنامان بدات)، هەروەك أبــو سُــلَيمان الــدّاراني (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتوویەتی: ئەگەر گوێت لە كەسێك بوو بە كەسێكی تری دەووت: لەسەر پردی (صِراط) دەتبینم تۆڵەت لێدەستێنمەوە، ئەگەر وای ووت: ئەوە بزانە ئەو كەسە نە پردی (صِــراط) دەناسێت و نەدەزانێت چەندێ ناخۆشی و نارەحەتی لەسەرە، چونكە ئەگەر ئەو كەسە بیزانیایە سەر پردی (صِــراط) چەندێ نارەحەتە ئەوە هەرگیز حەزی نەدەكرد نە هیچ كەس ببینێت و ڕایبگرێت، وە نە ئەمیش هیچ كەس ببینێت و ڕایبگرێت و دوای بخات [٨٩].

١٠. خێركردن و ووتنی ووتەی جوان و باش:

هاوەڵی بەڕێز عَــدي كوڕی حــاتَم (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِجْعَلُوا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ النَّارِ حِجَابًــا وَلَــوْ بِــشِقِّ تَمْرَةٍ))، وفي رواية: ((مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَتِرَ مِنَ النَّارِ وَلَوْ بِــشِقِّ تَمْــرَةٍ

---

وأبو نعيم في "الحلية" (٦/٦٧)، والرافعي (١/٢٦١)، والديلمي (٣/٥٣٤ رقم ٥٦٦٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٢٤٠).

[٨٩] بڕوانە: التخويف من النار والتعريف بحال دار البوار لابن رجب الحنبلي، تحقيق إياد القيسي (صفحة ٢٣٢).

فَلْيَفْعَلْ)) [٩٠].

واتـه: ئـەی موسـڵمانان لـه نێـوان خۆتـان و ئـاگری دۆزەخـدا بەربەسـت و پەردەیـەك دابنـێن ئەگـەر بەبەخـشینی لەتـه خورمایـەكیش بێـت (بەكـەمی مەزانن).

وه له فەرموودەیەكی تردا دەفەرمووێت: ئـەی موسـڵمانان هـەر یـەكێك لـه ئێوه دەتوانێت بەربەستێك بۆ خۆی دروست بكـات و خـۆی پـێ بپارێزێـت لـه ئاگری دۆزەخ ئەگەر بەبەخشینی لەته خورمایـەكیش بێـت، ئـەوه بـا بیكـات، كەمتەرخەم نەبێت و ئەو كاره بەكەم نەزانێت.

وه لـه فەرموودەیـەكی تـردا دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) باسـی ئـاگری دۆزەخی كردوو پەنای گرت به خوای پەروەردگار لێی، پاشـان باسـی ئـاگری دۆزەخی كردوو پەنای گـرت بـه خـوای پـەروەردگار لێـی ، ئیمـامی شُعبَـــة دەفــەرمووێت: بــه دڵنایيــەوه پێغەمبــەر (ﷺ) دوو جــار وای كــرد، پاشــان فەرمووی: ((اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ)) [٩١].

واته: ئەی موسڵمانان خۆتان بپارێزن له ئاگری دۆزەخ ئەگـەر بەبەخـشینی لەته خورمایەكیش بێت، ئەگەر ئەو لەته خورمایەتان نەبوو ببیەخشن (هـەژار بوون نەتانتوانی ماڵ ببەخشن)، ئەوه خۆتان بپـارێزن لێـی ئەگـەر بـه ووتنـی ووتەی جوان و باش و خێریش بێت.

---

[٩٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٥٦/٩)، والبخاري (٦٥٦٣)، ومسلم (١٠١٦)، والترمذي (٢٤١٥)، والنسائي (٢٥٥٢)، وابن ماجه (١٨٥)، والدارمي (١٦٥٧).

[٩١] رواه الإمام البخاري واللفظ له (٦٠٢٣)، ومسلم (١٠١٦)، والنسائي (٢٥٥٢).

**١١. ڕۆژوو گرتن:**

**هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة** (خوای لێ ڕازی بێت) **دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الصِّيَامُ جُنَّةٌ، وَحِصْنٌ حَصِينٌ مِنَ النَّارِ))** [٩٢].

**واتە: ڕۆژوو گرتن قەڵغانە، وە قەڵایەکی پتەوی پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ.**

**وە هاوەڵی بەڕێز عثمانِ کوڕی أبو العاص** (خوای لێ ڕازی بێت) **دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ))** [٩٣].

**واتە: ڕۆژوو گرتن قەڵغان و پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ، بە وێنەی ئەو قەڵغانەی کە خۆتانی پێدەپارێزن لە جەنگدا.**

**ئەو قەڵغان و پارێزگارییە بەهێزترو زیاتر دەبێت ئەگەر ئەو ڕۆژوو گرتنە لە کاتی جیهاد کردندا بێت، هەروەك هاوەڵی بەڕێز أبو أمامَة** (خوای لێ ڕازی بێت) **دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ جَعَلَ اللَّهُ بَيْنَهُ، وَبَيْنَ النَّارِ خَنْدَقًا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ))** [٩٤].

---

[٩٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٩/٢٠٨)، والبيهقي في شعب الإيمان (٣/٢٨٩، رقم ٣٥٧١)، وقال الهيثمي (٣/١٨٠): إسناده حسن، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع" (٣٨٨٠).

[٩٣] أخرجه أحمد (٤/٢١، رقم ١٦٣١٧)، والنسائي (٤/١٦٧، رقم٢٢٣٠)، وابن ماجه (١/٥٢٥، رقم ١٦٣٩)، والطبراني (٩/٥١، رقم٨٣٦٠)، والبيهقي في "شعب الإيمان" (٣/٢٩٠، رقم ٣٥٧٣)، وابن حبان (٨/٤٠٩، رقم ٣٦٤٩). وأخرجه أيضًا: إبن أبي عاصم في "الآحاد والمثاني" (٣/١٩٥، رقم ١٥٤٢)، والروياني (٢/٤٩٢ رقم ١٥٢٢)، والبزار(٦/٣٠٩، رقم ٢٣٢١)، وأبو نعيم في "الحلية" (٦/٢٦٥)، وصححه العلاّمة الألباني في "صحيح الجامع" حديث رقم: (٣٨٧٩).

[٩٤] رواه الترمذي (١٦٢٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٣٣٣).

واته: هەر موسڵمانێك تەنها یەك ڕۆژێك لە پێناو خوای پەروەردگاردا بە ڕۆژوو بێت، ئەوە خوای پەروەردگار لە نێوان ئەو موسڵمانە و ئاگری دۆزەخدا چاڵێك (خَندَق) دادەنێت بە ئەندازەی دووری نێوان ئاسمان و زەوی (ئەو موسڵمانە ئەوەندە دوور دەبێت لە ئاگری دۆزەخ).

**١٢. گریان لە ترسی خوای پەروەردگارو پاسەوانی کردن لە سنووری، چاو گرتن لە حەرامەکان (نەزەر نەکردن):**

هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لا يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ تَعَالَى حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ نَارِ جَهَنَّمَ فِي مَنْخِرَيْ مُسْلِمٍ أَبَداً)) [٩٥].

واتە: موسڵمانێك ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە کە لەبەر خوای پەروەردگار گریا بێت، هەتا شیر نەگەڕێتەوە ناو گوانی ئاژەڵ (کە ئەمەش شتێکی مەحاڵە)، وە هەرگیز تەپوتۆزی گۆڕەپانی جیهادو دوکەڵی ئاگری دۆزەخ لە لووتی موسڵماندا کۆ نابێتەوە، واتە: هەرگیز ئەو موسڵمانەی کە بەڕاستی دەجەنگێت و خوای پەروەردگار لێی وەردەگرێت ناچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

---

[٩٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/١٤)، والترمذي (١٧١/٤، رقم ١٦٣٣)، والنسائي (١٢/٦، رقم ٣١٠٨)، وهناد (٢٦٨/١ ، رقم ٤٦٥)، وقال: حسن صحيح، والحاكم (٢٨٨/٤، رقم ٧٦٦٧) وقال: صحيح الإسناد. والبيهقي في "شعب الإيمان" (٤٩٠/١، رقم ٨٠٠) وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٧٧٧٨).

وه هاوەڵی بەڕێز أَنَسِ کوڕی مالــك (خوای لـێ ڕازی بێت) دەفـەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((عَيْنَانِ لا تَمَسُّهُمَا النَّارُ أَبَدًا: عَيْنٌ بَاتَــتْ تَكْلأُ الْمُسْلِمِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَعَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ)) [٩٦].

واتە: دوو چاو هەن هەرگیز ئاگری دۆزەخ نایان گرێت و نایـان سـووتێنێت، چاوێك لـە پێنـاو خـوای پـەروەردگاردا شـەونخونی کردبێـت و پارێزگـاری لـە موسڵمانان کردبێت، وە چاوێك لە ترسی خوای پەروەردگار گریا بێت.

هاوەڵی بـەڕێز معاويـة کـوڕی حیـــدة (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ثَلاثَةٌ لاَ تَرَى أَعْيُنُهُم النَارَ عَينٌ حَرَسَــتْ فِــي سَبِيلِ اللهِ، وَعَينٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، وَعَينٌ كَفَتْ عَنْ مَحارِمِ اللهِ)) [٩٧].

واتە: سـێ کۆمـەڵ هـەن لـە موسڵمانان چاوەکانیان ئـاگری دۆزەخ نایـان سووتێنێت: چاوێك لە ترسی خوای پەروەردگار گریا بێت، وە چاوێك لە پێناو خوای پەروەردگار پارێزگاری لە موسڵمانان کردبێت، وە چـاوێك خاوەنەکـەی پاراسـتووبێتی لـە تێـڕوانین و سـەیرکردنی ئـەو کـارو شـتانەی کـە خـوای پەروەردگار حەرامی کردووە لێی (نەزەر نەکردن).

پاراستنی چاو (واتە: نەزەر نەکردن) یەکێکە لەو عیبادەتانەی کە زۆربـەی موسـڵمانان بێئاگـان لێـی و کەمتەرخـەمن تیایـدا بـە تایبـەتی لـەم کـات و سـەردەمەدا، لـە کاتێکـدا ئافرەتـانی لـە خـوا نەترسـی ئـەم سـەردەمە بـە

---

[٩٦] رواه الترمذي (١٦٣٩)، وأبو يعلى (٣٠٧/٧، رقم٤٣٤٦)، والطبراني (١٤٠/٧، رقم ٢٣٧٠)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن صحيح (١٢٣٠).

[٩٧] رواه الطبراني، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن لغيره (١٩٠٠).

شێوەیەکی زۆر بێشەرم و بێ حەیایانە خۆیان ڕووت کردۆتەوەو پۆشاکی شەرعی و پۆشتەیی و حەیاو حورمەتیان فڕێ داوەو پۆشاکی نادروست و ئابڕو چونانەیان پۆشیوە، ڕووتی و خۆ دەرخستن بە شێوەیەکی وا کە بە هیچ شێوەیەك لە سەردەمانی پێشوودا بوونی نەبووە، بەڵێ ئافرەتان بە هۆی خۆ نەپۆشینیان بە جل و بەرگی شەرعی جوانی خۆیان دەرخستووە، وە بوونەتە مایەی فیتنە بۆ پیاوان و زۆریان لە خشتە بردوون، بە تایبەتی لە دوای کرانەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە جیهاندا بە دەرکەوتنی کەناڵە ئاسمانیەکان (سەتەلایت و تەلەفزیۆن) و (تۆڕی ئینتەرنێت)، خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان بپارێزێت لە شەڕو خراپەو تاوانی ئەو ئامێرانە.

موسڵمانی خۆشەویست بەڕاستی (سەتەلایت و تەلەفزیۆن) و (تۆڕی ئینتەرنێت) پەنجەرەیەکی شەڕو خراپەکارین، پەنجەرەی ئەمڕۆو دەرگای خراپەکاری سبەی، ئەمڕۆ دڵۆپەو تکەتکەی فەسادەو سبەی ڕووباری خراپەو تاوانکاری و ماڵ وێرانی لێدەبارێت، بەڵێ ئەو ئامێرانە سەرەتاو دەستپێکەری تاوان و خراپەکاری و داڕووخانی ئیمان و ڕەوشتە، هەرچەندە خەڵکی شەڕو خراپەی بەکەم بزانن و بە سووك سەیری بکەن. بەڵێ لەبەر خوو گرتنێکی زۆرو حەز پێ بوونێکی زیاد پێیانەوە هەست کردنمان بە خراپەو تاوانیان ترسناکیانمان لە دەست داوە، بۆیە بوون و دەست پێوە گرتنیان زۆر بووەو هەست کردن بە خراپەیان کەم بووە.

موسڵمانی خۆشەویست کاتێك بیر لە حاڵی ئەمڕۆی موسڵمانان دەکەیتەوە دەبینیت چاومان کراوەتەوەو هەستمان بە ئاگا هاتووە لە زۆر کاردا، بەڵام گوێ و چاوو دڵەکانمان ڕاگرتووەو نایخەینە کەڕ بەرامبەر بەو هەموو تاوان و

خراپەکارییەی لەو ئامێرانەوە پیشان دەدرێت، جا فەرموودەی خوای پەروەردگارمان لەبیر چوو بێت یان بە دەستی ئەنقەست لەبیرمان کردبێت کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ (الإسراء:٣٦)

واتە: بەڕاستی گوێ و چاوو دڵ هەموویان بەرپرسیارن لە گوێ گرتن و تێڕوانین و ئارەزوو کردنی تاوان.

ئایا هیچ دانایییەکی تێدا هەیە تا ئێمەی موسڵمان بەو سادەو ساکاری و گوێ نەدانە بە سەرئەنجامی خراپی ئەو ئامێرانە ئاوها بە سووکی و ئاسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین؟ چونکە ئەوەندە خراپەو تاوان و فەسادی تێدایە ناتوانرێت باسی خێرو چاکەی بکرێت.

موسڵمانی خۆشەویستی نوێژخوێن ئامێرە پڕ لە تاوان و خراپەکارییەکانی وەکو: (سەتەلایت و تەلەفزیۆن) و (تۆڕی ئینتەرنێت) پلەی یەکەمی داگیر کردووە لە نێوان هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، کە ئەویش لە هەموویان ترسناکترو بە هێزترە بۆ دەست گرتن بەسەر مرۆڤەکاندا، زاڵ بوون و دەست گرتن بەسەر گرنگترین ئەندامی هەستیاری مرۆڤ (ئەندامی هەستیاری چاوو دڵەکان).

ڕۆڵی گرنگی باوکان، قوتابخانەکان، بەها بەرزەکان، پوچەڵ کراوەتەوەو هەڵوەشاوەتەوە، ئەمرۆ کەناڵەکان ڕۆڵی پەروەردەو فێرکردن دەبینن (فێرکردن و نیشاندانی کارە خراپ و بەدڕەوشتەکان).

موسڵمانان خوای پەروەردگار دروستی کردووین بۆ عیبادەت و گوێڕایەڵی کردنی خۆی، نەك بۆ گاڵتەو گەپ و تاوان و سەرپێچی، هەروەك

دەفـــــەرموویت: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ (المؤمنون: ١١٥ ).

واتە: ئایا وا گومـان دەبـەن و وای لێـك دەدەنـەوە كـە ئێمـە ئێوەمـان بـۆ گاڵتەو گەپ و بێمەبەسـت دروسـت كـردووە، وە ئێـوە وا گومـان دەبـەن كـە ناگەڕێنەوە لای ئێمە لە دواڕۆژدا (بێگومـان هـەمووتان دەگەڕێنـەوە لامـان و لێپرسینەوەتان لە گەڵدا دەكەین، لەسەر كارە خراپەكانتان، گوێ نەدانت بـە فەرمانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرە (ﷺ) خۆشەویستەكەی).

پێویستە ژیانمان بە هەموو ماناكانیەوە بۆ خوای پەروەردگار بێت هیچ كاتێك دانەبڕێت لە پەرستنی خوای پەروەردگاری تاك و تەنها، ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾ (الأنعام: ١٦٢- ١٦٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە موشریكین و هاوەڵ پەیداكەران بڵێ: من نوێـژ كـردنم (فـەرزەكانم و سـوننەتەكانم) سـەربڕینم و هـەموو ژیـانم "ئـەوەی لـەم دونیایەدا ئەنجامی ئەدەم و ئەوەی كە بەسەرم دێت "مردنم" واتە: هەموو ئەو كارە چاكانەی كە لەسەری ئەمرم تەنها بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانیانـە، ئەو خوایەی كە هـیچ هـاوەڵێكی نییـە، بـەو شـێوەیە فـەرمانم پـێ كـراوە كـە هەموو پەرستنەكان تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام بدەم، وە من یەكەم كەسم لەم ئوممەتە كە مل كەچم بۆفەرمانەكانی خوای گەورە.

بۆیە هەر كارێك و ڕەوشتێك پێچەوانەی ئەم بنەمایەو بەندایەتی كردنە بێت بۆ خوای پەروەردگار ئەوە لە شـەرعی پـیرۆزدا حەرامـەو ڕێگـەی پێنـەدراوە،

بەڵام ئەوەی ئەو بنەماو حیکمەتەی لە دڵ و دەروون و بۆچوونی ئێمـەدا لاواز کردووە: بینینی بانگەشـەی ڕوون و ئاشـکراو بـێ پەردەیـە بـۆ خـراپ بوونی بیروباوەڕو ڕەوشتی بەرز و تێکچونی شیرازەی کۆمەڵگا ...

با پێکەوە بیرێك لەو هەموو تاوان و خراپەو خراپەکاریانە بکەینەوە کە ئەو ئامێرانە لە خـۆی گرتـوون، کـە هـیچ کـەس ناتوانێت نکۆڵی لێبکـات مەگـەر کەسانی لە خۆبایی.

ئیمانـداران، قورئـان خوێنان، باوکـان، برایان، مێردەکان، خاوەن حەیاکان، کەسانی ناموس پارێز، گەنجان، باش بزانن و ئاگاداربن کە خوای پەروەردگار بە گوێماندا دەدات و دەفەرمووێت: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ (النـور: ٣٠-٣١).

واتە: ئەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـە پیـاوانی ئیمانـدار بڵـێ: بـا چـاوو داوێنیـان بپارێزن (چاو لە نەزەرو داوێن لە زینـا)، چـونکە چـاو گـرتن و داوێـن گـرتن و پاراسـتنیان زۆر پـاکترو باشـترە بۆیـان، بەڕاسـتی خـوای پـەروەردگار زۆر

شـارەزایە بـە خـودو نـاوەڕۆکی ئـەو کارانـەی کـە دەیکـەن، وە هـەروەها بـە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: با چاوو داوێنیـان بپـارێزن (لـە نـەزەرو زینـا)، ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ وە با جوانی خۆیـان دەرنەخـەن بۆ پیاوانی بێگانـەو نامـەحرەم جگـە لـەوەی کـە بەدەرەوەیـە و دیـارە لـە جـوانی (دەم وچـاوو دەسـتیان)، ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ وە بـا سـەرپۆشـەکانیان بەریدەنەوە بەسـەر سینگ بەرۆکیانـدا، ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ وە با جـوانی خۆیـان دەرنەخـەن زیـاد لـەوەی کـە دەردەکـەوێت، ﴿إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ﴾ مەگەر بۆ مێردیان یان باوکیان، ﴿أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان باوکی مێردەکانیان، ﴿أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان کوڕەکانیان یان کوڕی مێردەکانیـان (لـە ژنـی تریـان)، ﴿أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾ یـان براکانیـان یـان کـوڕی براکانیـان (برازایـان) یـان کـوڕی خوشـکەکانیان (خوشـکەزایان)، ﴿أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ﴾ یـان ئافرەتـانی (ئیمانـدار) یـان کـەنیزەکانیان، ﴿أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾ یـان ئـەو شـوێن کەوتەو پیاوانەی کە بی نیـازن لـە ئافرەتـان (وەك خزمـەتکارو پیـاوانی پـیرو پەککەوتەو نەخۆش کە ئارەزووی ژن و مێردایەتیان نییە)، ﴿أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ﴾ یان ئـەو منداڵـە کوڕانـەی کـە ئاگایـان لـە لەشـی (عەورەت) ئافرەتان نییە (منداڵن و باڵغ نەبوونـە)، ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾ وە بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: بـا لـە کـاتی ڕۆیـشتنیاندا قاچیان نەدەن بە زەویدا (تا دەنگی خڕخاڵ و پاوەنەکانیان بێـت) و بزانرێـت

بــەو جوانییــەی (پێیــان) کــە شــاردویانەتەوە، ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار ئەی ئیمانداران تا ڕزگارو سەرکەوتوو بن.

## زیــانەکـانی سەتەلایت و تەلەفزیۆن و تۆڕی ئینتــەرنێت

موســڵمانی خۆشەویست کـوا گوێڕایـەڵیمان بـۆ ئـەم ئایەتانـە لـە مامەڵـە کردنمان لە گەڵ (سەتەلایت و تەلەفزیۆن و تۆڕی ئینتەرنێت)، ئایا چـاوەکان شەونخوونی ناکەن و بەردەوام نین لـە تێڕوانین بـۆ دیمـەن و کـارە حـەرام و سەنج ڕاکێشەکان؟ بۆ ئافرەتانی پیاوان لە خشتەبەر؟ لاشـەو جـوانی خۆیـان بەوپەڕی بێباوەڕی و لە خوانەترسی و بێشەرمییەوە دەرخستووە.

برایانی موسـڵمان بـا ڕوون و ئاشـکرابین لەگـەڵ یـەکتردا، ئایا ئـەوەی لـە شاشـەکانەوە پیشان دەدرێـت تـەنها ئـارەزووی گـەنجان ناجولێنێـت؟ بـەڵێ بەڵکو فیتنەو ئاشوبن و ئارەزووی گەنجان و پیران دەجولێنێت، هەر یـەك لـە ئێمـەی مرۆڤــ دان بـەوەدا دەنێـت کـە خـوای پـەروەردگار حـەزو ویـست و ئارەزووی پێبەخشیوەو حەزوو ئارەزوومان هەیە.

بەڵــــێ بەلای گەورەو کاری بێشەرم و بێحەیایی لە ناو موسـڵماناندا بـە شێوەیەکی زۆر بەربلاوە، لە کاتێکدا دەبینیت ئافرتان (لە کـچان و خوشـکان و ژنــان) پێکــەوە لەگــەڵ پیــاوان لەبــەردەم شاشــەی (ســـەتەلایت و تەلەفزیۆنـەکان) دادەنیـشن، یـەك لـە دوای یـەك دیمـەنی پیـاوان و گـەنجان

پیشان دەدرێت لەو پەڕی گەنجانیەتی و جوانێتیاندا، پیاوی وا هەیە یەك جار غیرەت دەیگرێت و تـوڕە دەبێـت کاتێـك پیـاوێکی بێگانـە دەبینێـت سـەیری خێزانی دەکات و نەزەری لێدەکات، بەڵام سەد جـار غـیرەت دەیگرێـت تـوڕە دەبێت کاتێك دەبینێـت خێزانـی (کـچی، خوشـکی) سـەیری پیـاوێکی بێگانـە دەکات و نەزەری لێدەکات، ئەگەر ڕوو بەڕوو بێت! !، بەڵام ئەو ڕۆژە پیـاوان با هەست بە بێغیرەتی و بێدەسەڵاتی پیاوەتی خۆیان بکەن، کاتێك دەبینن ئافرەتانیان بە دیار شاشەی (سەتەلایت و تەلەفزیۆنـەکان)ـەوە دادەنیـشن و دەڕواننە (المصارعة الحرة) یان (فلان گۆرانی بێژی پیاوی عەرەبی یان بیـانی) یان (زنجیرە فیلمەکان) یان (دیمەنی ڕەقص و خۆبادان و تێکەڵاوی پیـاوان و ئافرەتان) یان (فیلمە بەدڕەوشتەکان کە ڕاسـتەوخۆو بـێ هـیچ پـێچ و پـەناو پەردەیەك فاحیشەی زیناو نێربـازی) پیـشان دەدرێـت، دەبینرێـت ئافرەتـان بەدیار ئەم بێ ڕەوشتییەوە دادەنیشن بێ ئەوەی دەسـەڵاتدارانیان (باوکـان، مێردەکان، براکانیان) ڕێگریان لێبکەن، هۆکار چییەو بـۆچـی؟

وەڵام: هەموویان بەشدارن لەو تاوانەدا، تۆ بـێ دەنگبـەو واز لـە مـن بێنـە، منیش واز لە تۆ دێنم، کاتێك ئافرەتان بێشـەرم و بـێترس ئـەوکارد دەکـەن بێگومـان بـاوك و مێـردو براکانیـشیان ئـەو کـارە دەکـەن بۆیـە غیرەتیـان ناجولێت تا ڕێگریان لێبکەن.

إذا كان رب البيت للدف ضارباً ... فشيمة أهل البيت كلّهم الرقص

واتە: ئەگەر خاوەن ماڵ و گەورەکەیان تەپڵ و دەف لێبدات، ئەوە سـیفەت و پیشەی دانیشتوانی ئەو ماڵە ڕەقص و خۆ بادان دەبێت! ! !.

ئەگەر گەورەو دەسەڵاتداری ئافرەتان خۆیان ئەو کارە بکەن ئـەوە هـەرگیز

غیرەتیان ناجولێت و ناتوانن ڕێگری لە ئافرەتەكانیان بكەن!!.

ئەمە یەكێكە لە زیانەكانی ئەو ئامێرانە، لەوەش خراپتر ئەوەیە فەسادو بەدڕەوشتی پێزیاتر دەبێت لە ڕێی خستنە ڕووی چەندین فیلم كە هەموویان باس لە دڵداری و خۆشەویستی دەكات، كە لە زانكۆو خوێندنگاو شوێنە گشتییەكان ڕوودەدات، بێ ئەوەی كەس و كاری ئافرەتان ئاگایان لێبێت، پاشان كۆتاییەكەی ژن و مێردێكی بەختەوەر (بە گومانی پڕوپوچی خۆیان)، ئەم فیلم و كارە بەدڕەوشتیانە دەخرێتە ڕووی كۆمەڵگای موسڵمانان، ئەو كۆمەڵگایەی كە پێویستە كچانی فێر بكات كە سەیركردنی پیاوان بۆیان و كۆبونەوە لەگەڵیان بە تەنها حەرامەو نادروستە!!!.

بەڵێ لەوەش خراپتر ئەوەیە شاشەی تەلەفزیۆنەكان دیمەنی سەرجێی ژن و مێرد پیشان دەدات لە هۆدەی نوستن و حەوانەی خۆیان، ئاخۆ دەبێ بۆچوونی منداڵیان چۆن بێت لەگەڵ بینینی ئەو دیمەنە؟ لە كاتێكدا ئیسلام فێریان دەكات سێ جار ئیزن وەرگرن تا ڕێگەیان بدرێت، بێنە ژوورەوە یان نا، دەبێ چی ڕێزو چی مامەڵەیەك بێت لەگەڵ كارە بە نرخ و بەهاكانی ئیسلامی پیرۆزدا؟

بەڕاستی كارەساتە، لەو كارەساتەش گەورەترو تاڵترو ترسناكتر ئەوەیە: داڕووخانی موسڵمانانە لە دین و ڕەوشت و عیبادەت و مێژووی پڕشنگداری پڕ لە ماندووبوون و شەونخونی و جیهاد كردنە بە هۆی تێڕوانین و خووگرتن بەو ئامێرە لەناوبەرانەوە.

بەڵێ داڕووخانی سەربەرزیی شوێنكەوتوانی ئوممەتی ئیسلام بەرامبەر غەرب و بێباوەڕان، بەوەرگرتنی ڕێڕەوی ژیان و هەڵس و كەوتیان و

نەهێشتنی پەردەی نێوەندی ڕق لێبونیان و دوور کەوتنەوە لێیان (الْبَراءُ مِنهُم)، سەیر کردنیان و بینیی هەڵس و کەوتیان بەبەردەوامی وای لە هەندێ موسڵمان کردووە شوێنی داب و نەریب و بۆچوونیان بکەوێت لە کاتێکدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾(المائدة: ٥١ ).

واتە: ئەی ئیمانداران گاورو جولەکە مەکەنە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆتان، ئەوان هەندێکیان هاوەڵ و خۆشەویستی یەکترن، هەر یەکێك لە ئێوەی موسڵمان خۆشەویستی هەبێت بۆیان و پشتگیریان لێبکات، ئەوە بێگومان لەوانە (بێباوەڕە وەکو ئەوان)، بەڕاستی خوای پەروەردگار هیدایەت و ڕێنمونی کەسانی زاڵم و ستەمکار ناکات.

خوای پەروەردگار وا دەفەرموێت: ئەی کوا وەڵامی تۆی موسڵمانی نوێژخوێن و قورئان خوێن و شوێنکەوتووی پێغەمبەر (ﷺ)؟ بە گومانی خۆت موسڵمانێکی باشی بەڵام مەرج نییە لای خوای پەروەردگار وا بیت.

شوێنەواری شوێن کەوتنی خراپی گاورو جولەکە بە هەندێك لە کوڕان و کچانی موسڵمانانەوە دیارە لە جل و بەرگ و سەر چاکردن و بگرە لە ووتووێژیشیاندا.

لەوەش ترسناکتر ئەوەیە منداڵ و جگەر گۆشەکانمان بدەینە دەست شاشەی تەلەفزیۆن و سەتەلایتەکان تا ژیانیان وێران بکەن و شەڕو خراپەکاری لە ناخیاندا بڕوێنن، گومان دروست کردن لە بیروباوەڕیان

بەرامبەر خوای پەروەردگار، ڕاهێنانیان لەسەر ئەنجامدانی چەندین کاری کوشتن و سەربڕین و تەقاندنەوەو شەڕ کردن، ژیان لە نێوان خەیاڵ و گوماندا، ترساندنیان بە بینینی ئەو کارە دڕندانەیەی کە پیشان دەدرێت.

موسڵمانی خۆشەویست ئەوەمان لە بیر نەچێت کاتێک بەرنامەی تەلەفزیۆنی دەکرێتەوە سەرەتاو دەستپێکی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزو چەند ئامۆژگارییەك دەبێت کە زۆربەی خەڵکی بێتاقەت دەبن بە بیستن و بینینیی (لەبەر ئەوەی حاڵی موسڵمانی ئیمان لاوازی ئەمڕۆ وایە کە بە بینین و بیستنی قورئان و فەرموودەو ووتارو ئامۆژگار بێتاقەت دەبن)، **نابێت ئەمانە چاومان کوێر بکات بەرامبەر ئەو هەموو خراپەیەی کە لە دواییدا پیشان دەدرێت.**

موسڵمانی خۆشەویست ئەمە زیان و خراپەی تەلەفزیۆنە، لە کاتێکدا چاو دەکەیتەوە دەبینیت هەموو سەربان و بان شوقەو بینایەك صەحنی سەتەلایتی بەسەرەوە دەبینرێت (مەگەر کەسانێك خوای پەروەردگار ڕەحمی پێکردبێتن)، بەڵێ بوونی ئەو سەتەلایت و ئامێرانە خاوەنەکەی ڕووبەڕووی چەندین تاوان و خراپەکاری دەکاتەوە، گومان دروست بوون لە بیروباوەڕی ئیسلام، دروست بوونی چەندین بیروباوەڕی بەتاڵ و پوچەڵ، وەرگرتنی بیروباوەڕی پڕو پووچ و باتڵی گاورو جولەکەو دارو بەردوو بت پەرستان.

لە هۆڵندا کۆنگرەیەکی جیهانی بەسترا کە زیاتر لە هەشت سەد هەزار پیاوی بانگ خوازی گاوری تێدا بەشدار بوو، مەبەستیش لە بەستنی ئەم کۆنگرەیە ئەوەبوو: چۆن بتوانن لە ڕێی بڵاو کردنەوەی ڕاستەوخۆ (لە ڕێی سەتەلایتەوە) خەڵکی بکەن بە گاور.

بەڵێ داڕووخانی ڕەوشت و ئەخلاق لە ڕێی بڵاوکردنەوەی چەندین فیلم و بەرنامەوە کە هەموویان بانگەشەکردنە بۆ نەهێشتن و لە دەست دانی ڕەوشتی بەرزی ئیسلام، چی فیلمێکی بیانی و عەرەبی هەیە دوور بێت لە دیمەنی ووروژاندنی لایەنی شەهوەت، خواردنەوەی مەی، بەکارهێنانی مادده سەرخۆشکەرەکان، ڕەقص و خۆ بادان، تێکەڵاوی پیاوان و ئافرەتان، دڵداری، گۆرانی و مۆسیقا، ......هتد؟.

وە زیانێك و ترسناکییەکی تر لە بوونی ئەو ئامێرانە ئەوەیە: ترسناکی لەسەر باری ئەمنی و هێمنی کۆمەڵگا دەبێت، پیشاندانی ئەو هەموو فیلمە توندوتیژیی و شەڕوشۆڵە هاندەرێکە بۆ ئەوەی کەسانێکی خراپەکار تووشی کوشتن و بڕین ڕفاندن و ترساندن ببن، هەروەك یەکێك لە دکتۆرە نەفسانییە غەربیەکان دەڵێت: ئەگەر بەندیخانە (السِّجْن) کۆکەرەوەی خراپەکاران و تاوانباران بێت، ئەوە تەلەفزیۆن و سەتەلایت سەرەتایەکە بۆ ڕوودانی ئەو هەموو خراپەو تاوانکارییە و بوونی خراپەکاران و تاوانباران.

**موسڵمانی خۆشەویست، کاتێك باسی ئەم بابەتە دەکەین پێویستە چەند حەقیقەت و ڕاستییەك بخەینە پێش چاو، وە ئاگاداریشی بین:**

**یەکەم:** ئامێرەکانی (سەتەلایت و تەلەفزیۆن) چەکێکی دووڕوون، واتە: بۆ لایەنی باشەو بۆ لایەنی خراپەش بەکاردێت، بەڵام ئەو کەسانەی هەیانەو بەکاریان دێنن زیاتر بۆ لایەنی خراپەو تاوان بەکاری دێنن، کە ئەویش لایەنە ژەهراوییەکەیەتی.

**دووەم:** ئەم ئامێرانە لایەنی باشەو خراپەی تێدایە، بەڵام خراپەو تاوان و زیانی زۆر زۆرترە لە سودو قازانجی، چۆن ئەگەر شیر تێکەڵ بە مەی بکرێت

حەرام دەبێت، هەرچەندە شیرەکەش حەلاڵە، ئەگەر ئەو ئامێرانەش بۆ حەرام بە کاربهێنرێن، ئەوە هەر حەرامە ئەگەر بشووترێت: چاکەی تێدایە، دڵۆپە چاکەیەك لە چاو دەریایەك خراپەو تاوان، مەگەر کەسانێك هەر لە بنەڕەتەوە تەنها بۆ زانستی شەرعی و چەند کارێکی باشەی تر بە کاری بهێنن، تەنانەت نابێت کەناڵێکی ئیسلامیشی تیابێت ئەگەر گۆرانی و مۆسیقاو بیدعەو هەندێ تاوانی تر بڵاو بکاتەوە، لەبەر ئەوەی چۆن دەووترێت: ئەو کەناڵانە دروست نییە چونکە خراپە بڵاو دەکەنەوە، ئەوە دەبێ بشووترێت: گۆرانی و مۆسیقاو بیدعەو چەند کارێکی تر حەرامە و نابێت بڵاو بکرێتەوە، چونکە ئەگەر کارێك حەرام بوو ئەوە ئەو کارە حەڵاڵ نابێت هەرچەندە موسڵمانیش ئەنجامی بدات، حەرام بە کردەوەی موسڵمان حەڵاڵ نابێت، هەرچەندە ئەو موسڵمانەی ئەو کارە دەکات بە لای خۆیەوە یان بە لای خەڵکییەوە کەسێکی باشە، کەسی باش هەرگیز بە خراپەو تاوان ناڵێت باش (باش لە باشەوەیە، خراپەش لە کەسی خراپ دەوەشێتەوە)، ئەگەر ئەو کەسە بانگەشەی لە خوا ترسان و شوێن کەوتنی قورئان و سوننەتیش بکات!!!.

**سێیەم:** ئەو شاشە بچوکەی تەلەفزیۆن و سەتەلایت بۆتە گەورەترین چەك بەدەست دوژمنانی ئیسلامەوە تا بتوانن لە ڕێیانەوە بیروباوەڕو ڕەوشت و بەها پیرۆزو بەرزەکانی ئیسلامی پێ لەناو بەرن.

**چوارەم:** تەلەفزیۆن و سەتەلایت دەسەڵاتی پەروەردەیی لە دایکان و باوکان و مامۆستایان و بانگەوازکاران سەندووەو ئەو ئامێرانە پەروەردەیان دەکەن، دەبینیت ئەو هەموو مۆدیل و مۆدیل کاریانەی لەناو موسڵماناندا هەیە

زۆربەی هەرە زۆری لە ڕێی ئەو ئامێرانەوە هاتۆتە ناو کۆمەڵگای موسڵمانی بێئاگاو شوێن کەوتووی گاورو جولەکەو بێباوەڕان، بۆیە پێویستە کەشتی تەقواو خۆپارێزی بخەینە ڕێ پێش هەستان و هاتنی لافاوی تاوان و خراپەی لەناوبەر.

برای موسڵمان، خاوەن سەتەلایت، خاوەن تەلەفزیۆن، فرۆشیاری گۆرانی وفیلمە خراپەکان، ئەی ئەو کەسەی کە دەڕوانیتە ئەو شاشە بەدڕەوشتییانە، باش بزانە هەر بە سەیرکردنێکت نوکتەیەکی ڕەش لەسەر دڵت دروست دەبێت و ڕەشایی تاوان یەك لە دوای یەك زیاد دەکات تا زاڵ دەبێت بەسەر سپیایی دڵتدا، ئەو کاتە دڵت دەمرێت و تەنها لاشەت زیندوو دەبێت، حەزت بە هەموو خراپەیەك دەبێت و ڕقت لە هەموو کارێکی خێرو چاکە دەبێت، لە چاکە دوور دەکەویتەوەو لە خراپە نزیك دەبیتەوە، خەم و خەفەت و دڵتەنگی بەناو چەوانتەوە دەردەکەوێت، چۆن بەختەوەر دەبیت لە کاتێدا خوای پەروەردگار فەرموویەتی؟: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ (طه: ١٢٤)

واتە: هەر کەسێك پشت لە یادو زیکری من هەڵبکات (شوێنی فەرمودەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکەوێت) ئەوە ژیانێکی تەنگ و ناڕەحەتی دەبێت (لە دونیاو لە ناو گۆڕدا) وە لە ڕۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکەین.

موسڵمانی خۆشەویست هەڵویستەیەك بکەو پرسیارێك لە خۆت بکە، تا کەی شوێنی هەواو ئارەزوو دەکەویت و خۆت دەخەیتە گێژاوی تاوان و خراپەکارییەوە؟ مردن و کاتی سەرەمەرگ بێنە پێش چاوی خۆت، ئەو ڕۆژە بێنە پێش چاوت بە زەلیلی و داماوی لەبەر دەستی خوای پەروەردگاردا

دەوەستیت، بەچی زمانێك وەلامی خوای پەروەردگار دەدەیتەوە؟ (بەو زمانەی خراپەیەك نەمابوو پێی نەكەیت؟)!!، بەچی پێیەك خۆت ڕادەگریت و دەوەستیت؟ (بەو پێیەی لەهەر شوێن و جێگایەك خراپە هەبوایە دەڕۆیشتی بۆی)!!!؟ وەلامت چییەو چی دەڵێیت كاتێك خوای پەروەردگار پێی ووتی؟ ئەی بەندەكەم بۆ بەگەورەمت نەزانی و ترسی منت لە دڵدا نەبوو؟ ئەی بەندەكەم بۆ شەرمت لێم نەكرد؟ بۆ منت بە چاودێر نەزانی بەسەرتەوە؟ ئایا ئاگادار بوون و بینینی منت بەكەم سەیر دەكرد؟ ئایا چاكەم لە گەڵدا نەكردبووی؟ ئایا نازوو نیعمەتم بەسەردا نەڕشتبووی؟

موسڵمانی خۆشەویست دینت، ڕەوشتی بەرزت، عەقڵی تەواوت، وە ئەو دڵەت كە لە خوای پەروەردگار دەترسێت، وە غیرەتت لەسەر ئافرەتانت، ئەم شتانە بە حەرام و خراپ دەزانێت، دەی سەركەوە بەسەر نەفستاو زاڵبە بەسەر ئارەزووتداو ئەو جیهازو شاشانە لە ماڵتدا دەركەو مەیهێڵە "خۆ ئەگەر ئەڵێی ئەمە ناگونجێ و ناكرێت (بەلام لە بنەڕتدا وانییە) ئەوە هەوڵبدە كەناڵێك لە ماڵەكەتدا مەهێڵە ئەگەر گۆرانی موسیقاشی تێدایە"، چونكە تۆی دەسەلاتدار لە ماڵەوە پێغەمبەر (ﷺ) بەرپرسێتی خستۆتە سەر شانت و پێت دەڵێت: ((... وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ...))[٩٨].

واتە: ... پیاوان شوان و بەرپرسن لە ماڵ و منداڵ و خێزانیان، وە پرسیاریان لێدەكرێت (لە دواڕۆژدا) لە بارەی بەرپرسیارێتێكەیانەوە....

دەی موسڵمان ئەو بەلایە لە ماڵەكەتدا دەربكەو واز بهێنە لە كڕین و

---

[٩٨] صحيح، أخرجه البخاري في "كتاب الجمعة" (٨٥٣)، ومسلم في "كتاب الإمارة" (١٨٢٩)، من حديث إبن عمر (ﷺ).

فرۆشتنی ئەو شتە خراپانە بهێنە.

برای بەڕێز زۆربەی هەرە زۆری ئـەو بەرنامـەو فیلمانـە بەرنامـە ڕێـژیان بـۆ کراوە بۆ نەهێشتنی دینی تـــۆ، بۆ داڕووخان و نەمانی ڕەوشتی بەرزو جوانی تـــۆی موسڵمان.

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێمان داوە کە فیتنە یەك لـە دوای یـەك بـە وێنـەی شەوی تاریك و ڕەش بەسەر ئەم ئوممەتەدا دێت کۆتاییەکەی لە سـەرەتاکەی خراپترە، وە موسڵمانانیشی لـێ ئاگـادار کردۆتـەوە، هـەروەك هـاوەڵی بـەڕێز أسامة کوڕی زید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێکیـان پێغەمبـەر (ﷺ) چووە سەر بەرزی و تەپۆلکەیەکی شاری مەدینەو فەرمووی: ((هَلْ تَرَوْنَ مَـــا أَرَى إِنِّي أَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ خِلَالَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ)) [٩٩].

واتـە: ئایـا نـابینن ئـەوەی کـە مـن دەبیـنـم؟ مـن دەبیـنـم فیتنـە بەسـەر ماڵەکانتاندا! بە وێنەی باران دەبارێت.

پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئەو فەرموودە پیرۆزەی فەرمووە، نە سەتەلایت، نـە تەلەفزیۆن، نە گۆرانی و فیلمـی خـراپ هـەبووە!! ئـەم شـتانە هیـچی نـەبوو پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرمووە، تـــو خـوا ئەگەر خۆشەویستمان (ﷺ) ئێستا زیندوو بوایەو حاڵی "ئیمان لاوازی و دوور کەوتنەوە لە شـەرع و تـاوان زۆری و چاکە کەسی" ئەمڕۆی موسڵمانانی ببینیایە دەبوایە چی بووتایە؟!!!

خۆشەویستان ئەگەر بە ووردی بڕوانینە بەرنامە داڕێژی دوژمنـانی ئیـسلام ئەوە زۆر بەڕوونی و ئاشکرایی دەبینین کە دوژمنانی ئیسلام جۆرەها بەرنامە

---

[٩٩] رواه البخاري (١٨٧٨)، ومسلم (٧٤٢٧).

دادەڕێژن بۆ لەناو بردنی ئیسلام، دەی کەوابوو موسڵمانان با دوژمنانی ئیسلام و فیڵ و تەڵەکانیان بناسین، چونکە مەبەستیان تەنها ئەوەیە بتکەن بە گاور یان جولەکە یان هاوڵ بڕیاردەر یان بێباوەڕبوون، یان کەمترین شت دڵت پەیوەست بێت بە ڕەوشت و داب و نەریتیان.

موسڵمانان شتێك کە خوای پەروەردگارو پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان جێگیر کردبێتین تا هەموو موسڵمانان ئاگاداری بن و بیزانن، ئەوەیە کە دوژمنانی ئیسلام جۆرەها بەرنامە دادەڕێژن بۆ لەناو بردنی دین و ماڵی موسڵمانان و لەناو بردنی خۆشیان، هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ﴿١٠٩﴾ ﴾ (البقرة: ١٠٩).

واتە: زۆرێك لە خاوەن کیتابەکان (گاورو جولەکە) لەبەر حەسوودیی و ناپاکیان پێیان خۆشەو حەزدەکەن دوای ئەوەی باوەڕتان هێناوەو موسڵمان بوونە کافرتان بکەنەوە، پاش ئەوەی کە بە تەواوی هەق و ڕاستیان بۆ ڕوون بوویەوەو زانیان کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ﴿٢١٧﴾ ﴾ (البقرة: ٢١٧).

واتە: بێگومان بن کە ئەو بێ باوەڕانە جەنگتان لەگەڵ دەکەن و هەرگیز کۆتایی ناهێنن و دەست هەڵناگرن "تا ئەگەر بۆیان بگونجێت" لە ئایینتان وەردەگێڕن.

بەندەکانی خوا گەورەترین هۆکارێك بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی دینی تۆی موسڵمان سەفەر کردنە بۆ وولاتانی شیرك و کوفرو بێ ڕەوشتی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((إِنِّي بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ الْمُشْرِكِينَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلِمَ ؟ قَالَ: لا تَرَاءَى نارَهُمَا)) [100].

واتە: من بەریم لەو موسڵمانەی کە نیشتەجێیە لەناو هاوەڵ بڕیاردەران، هاوەڵانی بەڕێز (خوایان لێ ڕازی بێت) وتیان بۆچی ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ ئەویش فەرمووی: لەبەر ئەوەی حوکمیان یەکسان نییە، وە هەندێ لە زاناکان فەرموویانە: لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار جیاوازی خستۆتە نێوان وولاتی موسڵمانان و وولاتی بێباوەڕان، بۆیە دروست نییە بۆ موسڵمان نیشتەجێ بێت لە وولاتی کافران کاتێك ئەوان ئاگریان کردەوەو ئەمیش بیان بینێت [101]. واتە:نزیك بێت لێیان و تێکەڵاویان بێت مەگەر بۆ کاری پێویست.

موسڵمانی خۆشەویست باسی سەفەرێك دەکەم کە لە مێشکی زۆربەی خەڵکیدا نییە، بەڵکو زۆربەی خەڵکی هەر بەسەفەری نازانن، بەڵێ منیش دەڵێم: ئەو سەفەرە نییە کە کەسی گەشتیار تیایدا ماندوو دەبێت، ناڕەحەتی تیابێت و لە ماڵ و منداڵ و کەس و کارو وولاتی دوور بێت و غەریب بێت، بەڵکو باسی سەفەرێك دەکەم پێویستی بە پاسپۆرت و شوێن

---

[100] رواه أبو داود (٢٦٤٧)، والترمذي (١٦٠٤)، و الطبراني في "المعجم الكبير" (٢/٤٤١/٢٢١٥)، وصححه الشيخ الألباني في "صحيح سنن أبي داود" (٣/٤٥/٢٦٤٥).

[101] بڕوانە: تفسير سنن أبي داود (معالم السنن) لأبي سليمان الخطابي (٢/١٦).

گرتن نییە، گەشتیار پێویستی بە تەمەنی دیاری کراو نییە، گەشتیار پێویستی بە هاوڕێ نییە، بەڵکو تەنها پێویستی بە هاوڕێیەتی کردنی شەیتان و نەفسی فەرمان کارێتی بە خراپە، گەشتێکە کەسی گەشتیار نەفسی تاوانباری ئەمیرێتی، کوێی ویست لێبێت دەیبات، لە نێوان وولاتان دەیگێڕێت، گەشتێکە پیاو بە ویستی خۆی بە تەنها لە گەڵ ئافرەتان دەمێنێتەوەو بەدەمیانەوە پێدەکەنێت و سەیری جوانیان دەکات، کە ئەوەش ئەو پەڕی بێ شەرمی و بێ حەیاییە.

ئەو سەفەرەی کە من باسی دەکەم بریتییە: لە سەفەر کردنی مرۆڤ بە عەق و دڵی بۆ وولاتانی شیرك و کوفرو داڕوخانی ئەخلاق و ڕەوشت لە ڕێگەی شاشەو کەناڵە ئاسمانییەکانەوە کە ئەمڕۆ ماڵی زۆربەی موسڵمانانی داگیر کردووە.

گەشت کردن بۆ ئەو وولاتانە لە ڕێگەی شاشەکانەوە (تەلەفزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت) زیان و ترسناکی زۆر زیاترە، وە پاشەڕۆژی زۆر ترسناکترە وەك لە سەفەر کردن بە لاشەو بە ڕێگەی دیاری کراودا، چونکە ئەو کەسەی بە دیار ئەو شاشانەوە دادەنیشێت و کاتی خۆی بە فیڕۆ دەدات تەنها سەیر دەکات و شت وەردەگرێت، بێئەوەی هیچ بەرەنگاری و ڕەددێکی هەبێت، بەڵام ئەو کەسەی بە لاشەی سەفەری پێویست دەکات بۆ ئەو وولاتانە بە ئاگایەو دەسەڵاتی بەسەر نەفسی خۆیدا هەیە، زیاتر لەو کەسەی کە بە عەق و دڵی گەشت دەکات بۆ وولاتانی شیرك و کوفرو داڕوخانی ئەخلاق و ڕەوشت لە ڕێگەی شاشەو کەناڵە ئاسمانییەکانەوە.

بەندەکانی خوا ئەو کەناڵە ئاسمانییە خراپانە کە زۆربەی خەڵکی ڕازییەو ڕێگەی داوە بێتە ناو ماڵەکانیان لە شەرعدا حەرامە، هەر چەندە کەسانێك بە باشی بزانن بڵێن باشەی تێدایە، بەڵێ منیش وا دەڵێم، بەڵام بێگومان دەبێت دان بەوەدا بنێین کە لایەنی باشەی سەدان جار کەمترە لە لایەنی خراپەو تاوانی.

**موسڵمانی خۆشەویست ئاگادارت دەکەمەوە بە سێ شت، ئاگادارکردنەوەیە بۆ هەموو پیاوێکی بەرپرس لە ماڵ و منداڵ و ئافرەتانی:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار فەرمانی بە بەندەکانی کردووە کە تەقوای بکەن و لێی بترسن، بەڵام پێت دەڵێم: کوا تەقواو ترسی تۆ لە خوای گەورە کاتێك بە چاوەکانت دەڕوانیتە ئەو کارە حەرام و خراپانە.

**دووەم:** خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردوویت کە خۆت و ماڵ و منداڵت لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت، هەروەك دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴿٦﴾ ﴾ (التحريم: ٦).

واتە: ئەی ئیمانداران خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ، ئەو ئاگرەی کە سوتەمەنییەکەی مرۆڤـ و بەردە (بەردی ڕەشی کبریت، زوو ئاگر دەگرێت و بەلاشەوە دەنووسێت)، خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگرێکی زۆر بە ئێشی ترسناك، وە لەگەڵ خۆتاندا ئەهلەکەشتان ڕزگار بکەن کە دەڵێن خۆشمان دەوێن، چۆن خۆشتان دەوێن لە کاتێکدا بە دەستی خۆتان بەرەو هەڵدێران و لەناو چوونیان دەبەن لەگەڵ بوونی ئەو ئامێرانەدا.

- ئەو کەسەی کە ئەهل و منداڵەکانی تووشی ئەو تاوانانە دەکات ئایا لەوە ناترسێت بەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت کە دەفەرمووێت: ((مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ إِلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ)) [١٠٢].

واتە: هیچ بەندەیەك نییە کە خوای پەروەردگار دەیکاتە بەرپرس و گەورەو دەسەڵاتدار، ئەو ڕۆژەی کە دەمرێت غەش و خیانەتی کردووە لەژێر دەستەکانی، ئەوە خوای پەروەردگار ڕێگەی بەهەشتی لێدەگرێت و نایکاتە بەهەشتەوە لەگەڵ کۆمەڵی یەکەم لە سەرفرازان، یان هەر نایکاتە بەهەشتەوە ئەگەر زوڵم و ستەم و خیانەت بە دروست و حەڵاڵ بزانێت [١٠٣].

موسڵمانی خۆشەویست وا گومان مەبە!! بڵێیت: ئەم فەرموودەیە تەنها مەبەستی گەورەو کاربەدەستانە، نەخێر هەرگیز وانییە، بەڵکو فەرموودەیەکی گشتیەو هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە فەرمانیان پێکراوە ژێر دەستەکانیان بپارێزن، پێشەوا لەسەرێتی حەق و مافی خەڵکی بپارێزێت، پیاوان لەسەریانە ماڵ و منداڵیان بپارێزن [١٠٤].

خۆ ئەگەر هەر پشت هەڵ دەکەیت و گوێ نادەیت بە حەق و شوێنی هەواو ئارەزوو و شەیتان دەکەویت، ئەوە ئاگادارت دەکەمەوە لە کاری **سێیەم**: ئەویش ئەوەیە: دوو شتت لەبەر دەمدایە، کە ڕاکردن نییە لێیان، **یەکەمیان**:

---

[١٠٢] رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ (٦٧٣١)، و مسلم (١/٨٧/٣٨٠)، وابن حبان في "صحيحه"(٤٤٩٥)، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[١٠٣] بڕوانە: شرح النووي على صحيح مسلم (٢/١٦٦).

[١٠٤] بڕوانە: المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم (١/٢٨٤).

خـوای پـەروەردگار بەشـەوو ڕۆژ نیعمـەتی بەسـەردا ڕشـتوویت، ئایـا لـەوە ناترسیت لە ناکاو خوای گەورە سزات بـۆ بنێرێـت (لەسـەر تاوانـەکانت)، ئایـا نازانیـت چـەند گـەل و هـۆز لـە ناوچـوون لـە چـاو تروکانێکـدا بـە هـۆی تاوانەکانیانەوە؟.

خۆ ئەگەر هەر واز ناهێنیت لە تاوان ئەوە کـارێکی تـرت لەبەردەمـدا مـاوە کە بەهیچ شێوەیەك ڕزگارت نابێت لێی: **ئەویش مانەوەو تـەنیایی نـاو گۆڕتـە،** پڕ بان دەم و چاوت بووە لە خۆڵ، لاشەت پڕ بووە لـە کرم و مـارو دووپـشك، پاشان کە زینـدوو دەکرێیتـەوە بەسـەری ڕووت و پێـی پـەتی لەبـەر دەسـتی خوای پەروەردگاردا دەوەستێندرێیت، حەسرەت و پەشیمانیت زیـاتر دەبێـت ئەو کاتەی کە خێزانت، کوڕت، کچت، برات، شوێنکەوتوانت، شانت دەگـرن و پێت دەڵێن: کوا مافمان؟ بۆ فێڵت لێکردین؟ بۆ غـەش و خیانـەتت لێکـردین؟ بۆ ئامۆژگاریت نەکردین؟ بۆ ڕێگـەی تاوانـت بـۆ ئاسـان کـردین؟ بـۆ دەمانـت بینـی بـەدیار کەناڵـە خراپەکانـەوە دانیـشتبووین و تاوانمـان دەکـرد بـەڵام ڕێگریت لێنەدەکردین؟ دەبێت حاڵت چۆن بێت لەو کات و ساتە ناڕەحەتەدا.

بـۆ هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە زۆر بـە سـادەیی ئـەو ئامێرانـە لـە ماڵـەوە دادەنـێن، **پێیـان دەڵـێم:** سـوێند بـە خـوای پـەروەردگار ڕادەگیرێیـت لەبـەر دەستی خوای پەروەردگاردا، وە پرسیارت لێدەکرێت، دەبێت وەڵامـت چـی بێت بەرامبەر خوای زانا بە هەموو ئاشکراو نهێنیەکان؟!!!

خۆ ئەگەر پاش هەموو ئەمانە هـەر وازت نـەهێناو شاشـەی تەلەفزیۆنەکـەت پڕ بوو لـە کـەناڵی خـراپ، ئـەوە بەدووری مـەگرەو لۆمـەی کوڕەکـەت مەکـە سبەینێ سەلیب لە مـل بکـات (ببێتـە گـاورو جولەکـە)، وە بـەدووری مەزانـە

کچەکەت بێ هیچ شەرم و بێ هیچ حەیایەك پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ کوڕانی بێگانە ببەستێت و هەر ڕۆژەی لەگەڵ کوڕێکدا دەرچێت بەملاولادا، وە بەدوور نازانرێت کە ئافرەتانی خاوەن مێرد پەیوەندی حەرام و ناشەرعی لەگەڵ دۆست و هاوڕێیانی مێردیان و کەسانی تردا ببەستن و تووشی تاوانی سەرشۆڕکەرو ئابڕوو بەری زیـــــــــنا ببن، ئەویش هەمووی بە هۆی بوونی ئەو ئامێر و کەناڵە خراپانەوەیە لە ناو ماڵەکانماندا!!!.

ئەوەی کە ئینسان دەیان بینێت لە شاشەی کەناڵەکانەوە بێگومان کاریگەری لەسەری دەبێت ئەگەر پاش ماوەیەکی زۆریش بێت، بەڵام شەیتان چاوو دڵی خەڵکی کوێر کردووە و ئاگایان لە خۆیان نییە، کەسی وا هەیە چەندین ساڵ هەوڵی داوە تا ماڵ و منداڵی چاك بکات، بەڵام لە ماوەیەکی زۆر کەمدا تووشی خراپەو تاوانی زۆریان دەکات، ئەویش بە هێنانی ئەو ئامێرو کەناڵە خراپانەیە بۆ ناو ماڵ و منداڵی.

موسڵمانی خۆشەویست حوکمی کڕین و فرۆشتنی تەلەفزیۆن و سەتەلایت لای ئەم زانا بەڕێزانە حەرامە، مەگەر سەدا سەد بۆ کاری باشە بەکار بهێنرێت: (الشَّيخ إبنُ حَميد، سَماحَةُ الشَّيخِ إبنُ باز، وَفَضيلَةُ الشَّيخ إبنُ [illegible]ين، وَفَضيلَةُ الشَّيخ إبنُ جبرين) (ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

[illegible] ئەگەر دەڵێیت من تازە ئەو ئامێرانەم هەیە چی بکەم؟ دەڵێم: لە خوا [illegible]ترسە و هەوڵبدە با کەناڵەکانت دینی بێت (قورئانی پیرۆزو شەرعی ئیسلام و بەرنامەی بەسوود بێت)، با کەناڵێکی تیا نەبێت کە خراپەو تاوانی تیا پیشان دەدرێت، تەنانەت با بە ناوی هەواڵ و زانیاری و وەرزش و ...هتد، شەیتان هەڵت نەخەڵەتێنێت و دەرگای خراپەت بۆ بکاتەوەو بە هۆیانەوە بێئاگا بیت

و تووشــی تــاوان بیــت، موسـڵمان پـاش هــەموو ئەمانــە ئــەوە مــاوە ئــەرکی سەرشانت بزانیت و هەستیت بە کاری خۆت *.

### ١٣. ڕوشت جوانی لەگەڵ خەڵکیدا:

هاوەڵی بـەڕێز عبدُالله کـوڕی مَــسعود (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ألا أُخبِرُكُمْ بِمَنْ يُحَرَّمُ عَلى النّارِ، أو بِمَنْ تَحرمُ عَلَيهِ النّار؟ عَلى كُلِّ قَريبٍ هَيِّنٍ سَهْلٍ))، وفي رواية للإمام أحمد أنَّهُ (ﷺ) قــال: ((حُرِّمَ على النّارِ كُلُّ هَيِّنٍ لَيِّنٍ سَهْلٍ قَرِيبٍ مِنَ النّاسِ)) [١٠٥].

واتە: ئایا هەواڵتان پێبدەم بە هەموو ئـەو موسڵمانانەی کـە پـارێزراون لـە ئــاگری دۆزەخ، یــان ئــاگری دۆزەخیــان لەســەر دورە، لەســەر هــەموو موسڵمانێکی ڕوو خۆشی نەرم ونیـان و لەسەرخۆو نزیـك لـە خەڵکــی. وە لـە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: ئـاگری دۆزەخ ڕیگـەی لـێگیراوە لـە سـووتان و ئازاردانی هەموو موسڵمانێکی ڕووخۆش و نەرم و نیان و لەسەرخۆو نزیـك لـە خەڵکـی.

---

* وەرگــێڕ.

[١٠٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/١٧٨)، والترمذي (٢٤٨٨)، وإبن حبان (٤٧٠)، وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: صحيح لغيره (٢٦٧٦).

## ١٤. ئارامگرتن لەسەر بوونی کچان و بەخێو کردنیان و چاودێری کردنیان بە چاکی:

دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ ابْتُلِيَ بِشَيْءٍ مِنْ الْبَنَاتِ فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنْ النَّارِ)) [١٠٦].

واتە: هەر موسڵمانێك تاقی کرایەوە بە بوونی کچان، ئارامی لەسەر گرتن، ئەوە ئەو کچانە بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ئافرەتێك هات بۆماڵمان دوو کچی لەگەڵدا بوو، داوای شتێکی لێکردم (خواردنێك)، منیش لە خورما زیاتر هیچم نەبینی لە ماڵ خۆماندا، بۆیە تەنها خورمام پێدا، ئەویش بەشی کرد لە نێوانیاندا و خۆی هیچی لێ نەخوارد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە ماڵەوە بۆم باس کرد، ئەویش فەرمووی: هیچ موسڵمانێك تاقی ناکرێتەوە بە بوونی کچان و ئارامیان لەسەر دەگرێت، ئیللا ئەو کچانە بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ.

هاوەڵی بەڕێز عُقبة کوڕی عَامِر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ كَانَتْ لَهُ ثَلاثُ بناتٍ فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ، وَأَطْعَمَهُنَّ، وَسَقَاهُنَّ وَكَسَاهُنَّ، كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ)) [١٠٧].

---

[١٠٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٥٠/١٩)، والبخاري (١٤١٨)، ومسلم (٢٦٢٩)، والترمذي (١٩١٣).

[١٠٧] رواه الإمام أحمد "لفتح الرباني" (٥٠/١٩)، وابن ماجه (٣٦٦٩)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٤٨٨).

واته: هەر موسڵمانێك سێ كچی هەبێت، ئارامیان لەسەر بگرێت، بە جوانی خواردنیان بدات، وە ئاویان بدات (نان و ئاویان بداتێ) وە جل و بەرگیان بۆ بكات (جل و بەرگی پۆشتەو شەرعی)، ئەوە ئەو كچانە بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ.

دایكی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلاَثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ)) [١٠٨].

واته: هیچ موسڵمانێك نییە لە ئوممەتی من كە سێ كچ، یان سێ خوشك بە خێو دەكات و چاكەیان لەگەڵدا دەكات و ڕەوشتی جوان دەبێت لەگەڵیاندا، ئیللا ئەو سێ كچە، یان سێ خوشكە بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ.

مُطَّلب كوڕی عَبدُالله المخزومي (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێكیان چووم بۆلای أُمُّ سَلَمَة خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)، أُمُّ سَلَمَة (خوای لێ ڕازی بێت) پێی ووتم: ئەی كوڕی خۆم ئایا فەرموودەیەكت بۆ باس بكەم كە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە؟ منیش ووتم: بەڵێ ئەی دایكی خۆم (خێزانەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دایكی ئیماندارانن)، ئەویش فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: هیچ موسڵمانێك نییە كە دوو كچ، یان دووخوشك، یان دوو ئافرەتی خزم و نزیكی بە خێو دەكات، ئەو مەسرەفەی كە دەیان كات حیسابی ئەجرو پاداشتی بۆ دەكات لای خوای پەروەردگار (لە بەر خوای

---

[١٠٨] رواه البيهقي، وصححه الألباني في صحيح الجامع (٥٣٧٢).

پەروەردگار بە خێویان دەکات)، تا بە هۆی بەخشینیەوە ئەو دوو کچە، یان ئەو دوو خوشکە، یان ئەو دوو ئافرەتە دەوڵەمەند دەبن، یان بێ پێویست دەبن لە بەخشین و مەسرەفی ئەو موسڵمانە، ئیللا ئەو دوو کچەی، یان ئەو دوو خوشکەی، یان ئەو دوو ئافرەتەی خزم و نزیکی بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ.

کاتێك دەووترێت: ئەو دوو کچە، یان ئەو دوو خوشکە، یان ئەو دوو ئافرەتە (ئافرەتان) بۆی دەبنە پەردەو بەربەست لە ئاگری دۆزەخ، دەبێت ئەو کەسە بە پەروەردەیەکی ئیسلامی و شەرعی پەروەردەیان بکات، چاك بوون لەگەڵیاندا و خزمەت کردنیان تەنها بۆ دونیا نەبێت، بەڵکو بۆ دواڕۆژیش بێت، کە دەبێت فێری چاکەیان بکات و ڕێگەی خراپەیان لێبگرێت.

## ١٥. ئارامگرتن لە کاتی توشبوون بە نەخۆشی گرانەتا:

هاوەڵی بەڕێز أبـــوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی پیاوێکی کرد کە نەخۆشی گرانەتای گرتبوو، پێی فەرموو: موژدەت لێبێت، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ((هِـيَ نَـارِي أُسَلِّطُهَا عَلَى عَبْدِي الْمُذْنِبِ لِتَكُونَ حَظَّهُ مِنْ النَّارِ)) [١٠٩].

واتە: ئەوە ئاگری خۆمە دەیدەم بەسەر بەندەی تاوانبارمدا تا بەشی بێت لە ئاگری دۆزەخ "سزای دواڕۆژی پێکەم دەبێت".

---

[١٠٩] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/١٣٥)، والترمذي واللفظ له (٢٠٨٨)، وإبن ماجه (٣٤٧٠)، والحاكم (١/٤٩٦)، وحسنه إبن كثير في "النهاية" (٢/١٢٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٣٢).

هاوەڵی بەڕێز أبوأمامة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الْحُمَّى كِيرٌ مِنْ جَهَنَّمَ، فَمَا أَصَابَ الْمُؤْمِنَ مِنْهَا كَانَ حَظَّهُ مِنَ النَّارِ)) (١١٠).

واتە: نەخۆشی گرانەتا لە گڕو تین و هەڵاوی گەرمی ئاگری دۆزەخەوەیە، بۆیە هەر موسڵمانێك تووشی بێت لە دونیادا، ئەوە بەشێتی لە ئاگر (واتە: لە دواڕۆژدا تووشی ئاگری دۆزەخ نابێت).

زانای پایەبەرز ئیمامی المُناوي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: هەر موسڵمانێك تووشی ئەو نەخۆشییە بێت ئەوە زۆر بە ئاسانی بەسەر پردی (صِراط)دا دەپەڕێتەوە، بە شێوەیەکی وا هەست بە ناخۆشی و ناڕەحەتی ناکات (١١١).

بۆیە دروست نییە جوێن بە نەخۆشی گرانەتا و هیچ جۆرە نەخۆشییەك بدرێت، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووین کە نابێت جوێن بە هیچ جۆرە نەخۆشییەك بدەین.

هەروەك هاوەڵی بەڕێز جابرِ کوڕی عَبدُالله (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆلای (أمّ السّائب، یان أمّ المُسیّب)، فەرمووی: ئەوە چیتە (أمَّ السّائب، یان أمَّ المُسیب) هەڵدەلەرزیت؟ ئەویش ووتی: الحُمَّى لا بَارَكَ اللهُ فِيهَا! فَقَالَ: لا تَسُبِّي الحُمَّى فَإِنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ كَمَا يُذْهِبُ الكِيْرُ خَبَثَ الحَدِيدِ)) (١١٢).

---

(١١٠) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧/١٦٠)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٣١٨٨).

(١١١) بڕوانە: فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (٣/٤٢١).

(١١٢) رواه الإمام مسلم واللفظ له (٢٥٧٥)، وابن ماجه (٣٤٦٩).

واته: ووتی: نەخۆشی گرانەتامە، خوا بەرەکەتی تێنەکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نا، جوێنی پێ مەدە، چونکە ئەو نەخۆشییە تاوانی موسڵمان لا دەبات و نایهێڵێت هەروەك چۆن ئاگر خڵت و خاش و پیسی ئاسن ناهێڵێت، (تووشبوون بە نەخۆشی گرانەتا پاك بوونەوەیە لە تاوان).

## ١٦. سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی ناو هێنانی یان بیستنی ناوی:

مُحَمَّدِ کوڕی عَلـي کوڕی حُسَين (خوایان لێ ڕازی بێت) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَم يُصَلِّ عَلَيَّ فَقَدْ خَطِئَ طَرِيْقَ الْجَنَّةِ)) [١١٣].

واتە: هەر موسڵمانێك ناوی منی لا هێنرا (باسکرا) سەلاواتی لەسەرم نەدا، ئەوە بەڕاستی ڕێگەی ڕاستی بەهەشتی هەڵە کردووە [١١٤].

واتە: هەر موسڵمانێك ناوی پێغەمبەری (ﷺ) بیست و بە دەستی ئەنقەست سەلاواتی لەسەر نەدا (گرنگی پێنەداو بەگەورەی نەزانی)، ئەوە بەڕاستی ڕێگەی بەهەشتی هەڵە کردووە، وە ڕێگەی ڕاستی بەهەشتیش تەنها ڕۆیشتنە بەسەر پردی (صِراط)دا، وە هەر کەسێك ڕێگەی (صِراط) هەڵە بکات، ئەوە هیچی بۆ نەماوە مەگەر بەر بونەوەو کەوتنە خوارەوە لەسەر پردی (صِراط)ـەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

واتای فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت: کە هەر موسڵمانێك کاتێك ناوی

---

[١١٣] رواه البيهقي في الشعب (١٥٧٣)، وصححه الألباني في "فضل الصّلاة على النبي" (ﷺ) (٤٤).

[١١٤] بڕوانە: شرح "عمدة الأحكام" للشّيخ عَبد الله بن عبد الرحمن بن عبد الله بن جبرين (١٣/٢١).

پێغەمبەر (ﷺ) دەبیستێت و سەڵاواتی لەسەر دەدات و دەڵێت: (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) یان (صَّلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم)، ئەوە ڕێگەی بەهەشت هەڵە ناکات و لێی ناگۆڕێت، بەڵکو ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەبێت، وە ڕێگەی ڕاستی بەهەشتیش بریتیە لە پەڕینەوە بەسەر پردی (صِراط)دا بە ئاسانی و چوونە ناو بەهەشت، دەی کەوابوو موسڵمانی خۆشەویست هەر کاتێك ناوی پێغەمبەری خۆشەویستت (ﷺ) بیست، بڵێ: (عَلَيهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) یان (صَّلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم)، تا ڕێگەی بەهەشت هەڵە نەکەیت.

هاوەڵی بەڕێز حُسَينِ کوڕی ئیمامی عَلي (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَخَطِئَ الصَّلاةَ عَلَيَّ، خَطِئَ طَرِيقَ الْجَنَّةِ)) [١١٥].

واتە: هەر موسڵمانێك ناوی منی لا هێنراو بیستی، وە بە دەستی ئەنقەست سەڵاواتی لەسەرم نەدا، ئەوە بەڕاستی ڕێگەی بەهەشتی هەڵە کردووە.

هاوەڵی بەڕێز إبنُ عَبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ نَسِيَ الصَّلاةَ عَلَيَّ خَطِئَ طَرِيقَ الْجَنَّةِ)) [١١٦].

واتە: هەر موسڵمانێك بەدەستی ئەنقەست سەڵاوات لەسەرم نەداو وازی لێبهێنێت، ئەوە بەڕاستی ڕێگەی بەهەشتی هەڵە کردووە.

زانای پایەبەرز ئیمامی المُناوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ووشەی (نَسِيَ) واتە: بەدەستی ئەنقەست سەڵاوات لەسەرم نەداو وازی لێبهێنێت،

---

[١١٥] رواه الطبراني في "الأوسط"، وحسنه إبن حجر في "الفتح" (١٧٢/١١ ح ٦٣٥٨)، والسيوطي في "الجامع الصغير" (٨٦٧٩)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٢٤٥).

[١١٦] رواه إبن ماجه (٩٠٨)، والبيهقي (٥٨٧٢)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٥٦٦٨).

چونکە هەندێ جار ووشەی (النّسيان) بە واتای واز لێبهێنان و پشت گوێ خستن دێت، نەك بەواتای لەبیر چوون، چونکە کاتێك کەسێك شتێکی لە بیر دەچێت هیچی لەسەر نییە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ﴾ (طه: ١٢٦).

واتە: ئایەتەکانی ئێمەت پێگەیشت پشت گوێت خست و وازت لێهێنا بە ویستی خۆت [117].

هاوەڵی بەڕێز جابرِ کوڕی سَمُرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەر لە پلەی یەکەم فەرمووی: (آمين)، وە پلەی دووەمیش ووتی: (آمين)، وە لە پلەی سێیەمیش ووتی: (آمين)، پاشان کە هاوەڵانی بەڕێز پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆچی سێ جار ووتت: (آمين)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أَتَانِي جِبْرِيلُ (عليه السلام)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ أَدْرَكَ أَحَدَ وَالِدَيْهِ، فَمَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، قُلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ أَدْرَكَ شَهْرَ رَمَضَانَ، فَمَاتَ، فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، فَأُدْخِلَ النَّارَ، فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، قُلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ، قَالَ: وَمَنْ ذُكِرْتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، فَأَبْعَدَهُ اللَّهُ، قُلْ آمِينَ، فَقُلْتُ: آمِينَ)) [118].

واتە: کاتێك ئەم ووت: (آمين)، ئەوە جبريل (عليه السلام) بوو هات بۆ لام و پێی ووتم: ئەی مُحَمَّد (ﷺ) هەر موسڵمانێك یەکێك لە دایك و باوکی پیر بوون و

---

(117) بڕوانە: فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (٦/١٢٩).

(118) رواه الطبراني (١٩٩٠)، وابن حبان (٤١٠)، وصححه الألباني في "التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان" (٤٠٩).

کەوتنە لای، ئەو موسڵمانە ئەوەندە چاکەی لەگەڵدا نەکردن تا بە هۆیانەوە بچێتە بەهەشتەوە، بەڵکو خراپ بوو لەگەڵیان، کاتێك مردوو چووە ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕەحم و بەزەیی خۆی دووری بخاتەوە، بڵێ: (آمین)، منیش ووتم: (آمین)، کاتێك لە پلەی دووەم ووتم: (آمین)، جبریل (ﷺ) پێی ووتم: ئەی مُحَمَّد (ﷺ) هەر موسڵمانێك کاتێك مانگی ڕەمەزانی پێگەیشت ئەوەندە چاکەی تیا نەکرد تا بە هۆیەوە بچێتە بەهەشتەوە، بەڵکو خراپەی تیا دەکرد (بە ڕۆژوو نەدەبوو، تاوانی تیا ئەنجام دەدا)، کاتێك مردوو چووە ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕەحم و بەزەیی خۆی دووری خاتەوە، بڵێ: (آمین)، منیش ووتم: (آمین)، کاتێك لە پلەی سێیەم ووتم: (آمین)، جبریل (ﷺ) پێی ووتم: ئەی مُحَمَّد (ﷺ) هەر موسڵمانێك کاتێك ناوی تۆی لا هێنراو بیستی، بەڵام سەلاواتی لەسەرت نەدا، تا بە هۆیەوە بچێتە بەهەشتەوە، بەڵکو گوێی پێنەداو پشت گوێی خست و بە کەمی زانی، کاتێك مردوو چووە ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕەحم و بەزەیی خۆی دووری خاتەوە، بڵێ: (آمین)، منیش ووتم: (آمین).

ئەم فەرموودانە بەڵگە نین لەسەر واجبێتی سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) هەر کاتێك ناوی باسکرا، هەروەك زانای پایەبەرز إبن حَجَر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئەم فەرموودانە بەڵگە نین لەسەر واجبێتی سەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و سوننەتێتی و جەختکراوی سەلاواتدان لەسەری (ﷺ) هەرکاتێك ناوی بیسترا، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی داواکراوە لەو کەسەی کە زۆر جار ناوی پێغەمبەر (ﷺ)

دەبیستێت و سەڵاواتی لەسەر نادات، تا سەڵاواتی لەسەر بدات کاتێك ناوی بیست، وە ئەم فەرموودانە بەڵگەش نین لەسەر واجبێتی دووبارە کردنەوەی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) هەر کاتێك ناوی دووبارە کرایەوە لە دانیشتنێکدا [119].

## ١٧. فریاکەوتنی "الله أکبر"ی نوێژ دابەستن لەگەڵ ئیمامدا:

فریاکەوتنی "اللهُ أکـبر"ی نوێژ دابەستن لەگەڵ ئیمامدا چل ڕۆژ بە بەردەوامی موسڵمان دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، هاوەڵی بەڕێز أنَسِ کوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((مَـنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنْ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنْ النِّفَاقِ)) [120].

واتە: هەر موسڵمانێك چل ڕۆژ لەسەر یەك و بە بەردەوامی نوێژ بە جەماعەت بکات تەنها بۆ خوای پەروەردگار (دوور بێت لە ڕیاو خۆ دەرخستن و ....)، ئەوە لە دوو شت پارێزراو دەبێت، لە ئاگری دۆزەخ و لە دووڕوویی.

موسڵمان ناتوانێت فریای "الله أکبر"ی نوێژ دابەستن بکەوێت لەگەڵ ئیمامدا مەگەر زوو بچێت بۆ نوێژ، هەندێك لە پیاوچاکانی ئەم ئوممەتە ئەگەر فریای "الله أکبر"ی نوێژ دابەستن نەکەوتنایە لەگەڵ ئیمامدا ئەوە سەرەخۆشیان لە خۆیان دەکرد، لەبەر ئەوەی ئەو دوو شایەتییە گەورەیەیان لە دەست چووە

---

[119] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري لإبن حجر العسقلاني (١١/١٧٣ ح ٦٣٥٨).

[120] رواه الترمذي (٢٤١)، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٣٦٥).

لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، پارێزراوی لە ئاگری دۆزەخ و لە دووڕوویی.

ئیمامی إبـــراهیم النّخعـــي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێت) دەڵێت: کاتێك بینیت موسڵمانێك کەمتەرخەمەو دوا دەکەوێت لە "الله أکبر"ی نوێژ دابەستن لەگەڵ ئیمامدا ئەوە دەستی لێ بشۆ (واتە: پیاوێکی باش نییە)[121].

تـابعی بـەڕێز سَـــعید کـوڕی الُمـــسَیّب (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) لێـی گێڕدراوەتـەوە کـە نزیکـەی چـل سـاڵ "الله أکـــبر"ی نوێـژ دابەسـتنی لەگـەڵ ئیمامدا لە دەست نەچووە، لەبەر ئەوەی بەردەوام لـە صـەفی یەکـەم نوێـژی کردووە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ).

ئیمامی وَکیع (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی أعْمَش (ڕەحمەتی خوای لێبێـت) نزیکـەی حـەفتا سـاڵ "الله أکـــبر"ی نوێـژ دابەسـتنی لەگـەڵ ئیمامـدا نەفەوتاوە[122].

## ١٨. گرتنی دەست نوێژ بە جوانی:

دەست نوێژ جوان گرتن بۆ نوێژ لاشەی موسڵمان دەپارێزێت لە گڕو تـین و شـاڵاوی ئـاگری دۆزەخ کاتێـك ئـەو موسـڵمانە بەسـەر پـردی (صِـــراط)دا تێدەپەڕێت.

هاوەڵی بـەڕێز عَبدالله کـوڕی عَمْـــرو (خوایـان لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) گەڕاینەوە لـە شـاری مەککـەوە بۆ شـاری

---

[121] بڕوانە: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم (٢/٥١).

[122] بڕوانە: صفة الصفوة لابن الجوزي (٢/٦٩).

مەدینە، لە ڕێگا ئاوێکمان لێدەرکەوت، کاتی نوێژی عەسر بوو هەندێ لە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) پەلەیان کرد لە پێش ئێمەوە چوون بۆ دەست نوێژ گرتن، کاتێك گەیشتینە لایان بینیمان پاژنەی پێیان تەڕ نەبووە (ئاوی بەرنەکەوتبوو)، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بینیتیانی فەرمووی: ((وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ، أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ)) [123].

واتە: هاوار بۆ ئەو کەسانەی کاتێك نوێژ دەگرن و پاژنەی پێیان تەڕ ناکەن، موسڵمانان کاتێك دەست نوێژ دەگرن پاژنەی پێتان تەڕ بکەن و جوان دەست نوێژ بگرن.

جارێکیان أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) کەسانێکی بینیی دەست نوێژیان دەگرت، پێیانی فەرموو: گوێم لە أبو القاسم (واتە: پێغەمبەری خوا) (ﷺ) بووە، دەیفەرموو: ((وَيْل لِلْعَرَاقِيبِ مِنْ النَّار)) [124].

واتە: هاوارو لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کاتێك دەست نوێژ دەگرن و پاژنەی پێیان تەڕ ناکەن.

## ١٩. سەلام کردن و خواردن بەخشین و شەو نوێژ کردن:

عَبدالله کوڕی سَلام (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ شاری مەدینە، خەڵکی کەوتنە ڕێ بۆ بینینی پێغەمبەر (ﷺ)، دەووترا: پێغەمبەر (ﷺ) هات، پێغەمبەر (ﷺ) هات،

---

[123] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٤٢/٢)، والبخاري (٦٠)، ومسلم واللفظ له (٢٤١)، والنسائي (١١١)، وأبو داود (٩٧)، وإبن ماجه (٤٥١).

[124] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٤٢/٢)، ومسلم واللفظ له (٢٤٢)، وإبن ماجه (٤٥٢).

پێغەمبەر (ﷺ) هات، عبداللە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: منیش نزیك بوومەوە ویستم ڕووی پێغەمبەرم (ﷺ) لێدەربکەوێت، کاتێك ڕووی پێغەمبەرم (ﷺ) بینی بۆم دەرکەوت ئەم دەم و چاوو ڕووە گەشە ڕووی کەسێکی درۆزن نییە، یەکەم وتەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو دەیفەرموو: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ، وَصِلُوا الأَرْحَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ)) (١٢٥).

واتە: ئەی خەڵکینە خواردن ببەخشن (بە فەقیرو هەژاران)، وە سەلام بکەن، وە سیلەی ڕەحم بە جێ بگەیەنن لە گەڵ خزم و کەس و کارتاندا، وە شەو نوێژ بکەن لە کاتێکدا خەڵکی خەوتوون، ئەگەر ئەم کارانەتان کرد ئەوە بە سەلامەتی دەچنە بەهەشتەوە.

حیکمەت لە باس کردنی چوونە بەهەشت بە سەلامەتی بۆ موسڵمانێك کە ئەم کارانە دەکات، ئەوەیە: کاتێك موسڵمان بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات بە سەلامەتی دەپەڕێتەوە بێئەوەی ئاگری دۆزەخ بیسوتێنێت.

---

(١٢٥) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٣٣١/١٧)، والترمذي واللفظ له (٢٤٨٥)، وابن ماجه (١٣٣٤)، والدارمي (١٤٦٠)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٧٨٦٥).

**٢٠. هەر موسڵمانێك كۆتا ووشەی ( لا إله إلا الله ) بێت:**

هەر موسڵمانێك كۆتا ووشەی ئەم زیكرانە بێت ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە: ((لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)).

هاوەڵانی بەڕێز أبوهريرة و أبوسعيد الخدري (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموون: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا قَالَ الْعَبْدُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ، قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: صَدَقَ عَبْدِي لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا وَأَنَا أَكْبَرُ، وَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا وَحْدِي، وَإِذَا قَالَ: لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَلا شَرِيكَ لِي، وَإِذَا قَالَ: لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا لِي الْمُلْكُ وَلِيَ الْحَمْدُ، وَإِذَا قَالَ: لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِي، مَنْ رُزِقَهُنَّ عِنْدَ مَوْتِهِ لَمْ تَمَسَّهُ النَّارُ)) [١٢٦].

واتە: هەر كاتێك بەندەی موسڵمان ووتی: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ"، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بەندەكەم ڕاستی كرد، بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە من، وە من لە هەموو كەس و شتێك گەورەترم، وە هەر كاتێك بەندەی موسڵمان ووتی: "لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ"، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بەندەكەم ڕاستی كرد، بەڕاستی هیچ

---

[١٢٦] رواه الترمذي (٣٤٣٠)، وابن ماجه واللفظ له (٣٧٩٤)، وابن حبان (٨٥١)، والحاكم (١/٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٧١٣).

پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە من بە تاك و تەنها، وە هەر كاتێك بەندەی موسڵمان ووتی: "لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ لَا شَرِيكَ لَهُ"، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بەندەكەم ڕاستی كرد، بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە من، وە من هیچ هاوەڵ و شەریكێكم نییە، وە هەر كاتێك بەندەی موسڵمان ووتی: "لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ"، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بەندەكەم ڕاستی كرد، بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە من، وە هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس و ستایشی تەواو تەنها بۆ منە، وە هەر كاتێك بەندەی موسڵمان ووتی: "لا إِلَهَ إِلاَ اللَّهُ وَلا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلاّ بِاللَّهِ"، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: بەندەكەم ڕاستی كرد، بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە من، وە هیچ هەڵس و كەوتوو هێزێك ناكرێت جگە بە من نەبێت، هەر موسڵمانێك لە كاتی سەرەمەرگیدا ئەمانە بڵێت ئەوە ئاگری دۆزەخ نایسووتێنێت.

### ٢١. پەناگرتن بە خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ:

هاوەڵی بەڕێز أَنَسِ كوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا سَأَلَ رَجُلٌ مُسْلِمٌ الْجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَطُّ، إِلاّ قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَلا اسْتَجَارَ مِنْ النَّارِ، إِلاّ قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ)) [١٢٧]

---

[١٢٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٦٣)، والترمذي واللفظ له (٢٥٧٢)، والنسائي (٥٥٢١)، وابن ماجه (٤٣٤٠)، والحاكم (١/٥٣٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٢٧٥).

واته: هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە لە پیاوان و ئافرەتان سێ جار داوای بەهەشت بکات، ئیللا بەهەشت دەڵێت: خوایە ئەو بەندەیە بکە بەهەشتەوە، وە هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە لە پیاوان و ئافرەتان سێ جار پەنا دەگرێت بە خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ ئیللا دۆزەخ دەڵێت: خوایە ئەو بەندەیە بپارێزە لە ئاگری دۆزەخ.

وە فەرمانمان پێکراوە کە دوای هەموو تەحیاتێك و پێش سەلامدانەوە لە نوێژدا پەنا بگرین بە خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ، هەروەك أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)) (١٢٨).

واتە: هەر یەکێك لە ئێوە کاتێك تەحیاتتان خوێند پێش سەلامدانەوە پەنا بگرن بە خوای پەروەردگار تا پەناتان بدات و بتان پارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، واتە: ئەو موسڵمانە بڵێت: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)).

واتە: ئەی پەروەردگار پەنات پێدەگرم لە سزای ئاگری دۆزەخ، وە لە سزای ناو گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە ناڕەحەتی و تاقی بوونەوەی ژیان و مردن، وە پەنات پێدەگرم لە فیتنەو ئاشوبی دەجال.

---

(١٢٨) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٤/٢٩)، والبخاري (١٣٧٧)، ومسلم واللفظ له (٥٨٨)، والترمذي (٣٦٠٤)، والنسائي (٥٥٠٥)، وابن ماجه (٩٠٩)، والدارمي (١٣٤٤).

هەر موسڵمانێك پەنابگرێت بە خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ ئومێدە خوای پەروەردگار بیپارێزێت لێی، وە ڕزگاری بکات لە شالاوی ئاگری دۆزەخ کاتێك بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات.

## ٢٢. ئازادکردنی (کۆیلە):

هاوەڵی بەڕێز أبوهریرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ)) [١٢٩].

واتە: هەر موسڵمانێك بەندەیەکی موسڵمان ئازاد بکات، ئەوە خوای پەروەردگار بەهەر ئەندامێکی لاشەی ئەو بەندەیە ئەندامێکی لاشەی ئەو موسڵمانە ئازاد دەکات لە ئاگری دۆزەخ، تا داوێنی ئەو موسڵمانە بە ڕزگارکردنی ئەو بەندەیە ڕزگار دەکات، (واتە: خوای پەروەردگار ئەو موسڵمانە ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ بە وێنەی ئازادکردنی ئەو کۆیلەیە، هەتا ئەگەر ئەو موسڵمانە بە داوێنی تاوانیشی ئەنجام دابێت ئەوە خوای پەروەردگار بە ئازاد کردنی ئەو بەندەیە ئازادی دەکات، جگە لە زینا چونکە زینا تاوانی گەورەیەو پێویستی بە تەوبە هەیە).

---

[١٢٩] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/١٤٠)، والبخاري واللفظ له (٦٧١٥)، ومسلم (١٥٠٩)، والترمذي (١٥٤١)، والنسائي (٣١٤٥).

**چۆن "کۆیلە" ئازاد دەکەیت؟ یان چۆن پاداشتی کۆیلە ئازاد کردنت دەست دەکەوێت؟**

موسڵمانی خۆشەویست ئەو ڕێگایانەی کە ئیسلام گرتویەتیەبەر بۆ ئازادکردنی کۆیلە زۆرن، لەوانە:

**ئازادکردنی کۆیلە لە کەفارەتی کوشتنــدا**، خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ ﴾ (النساء: ٩٢).

واتە: هیچ باوەڕدارێك ڕێگەی پێنەدراوەو بۆی نییە کە باوەڕدارێکی تر بکوژێت مەگەر بە هەڵە، وە هەر کەسێك مرۆڤێکی باوەڕداری بە هەڵە کوشت، ئەوە دەبێت لە تۆڵەیدا دوو شت ئەنجام بدات، **یەکەم:** (فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ) ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕدار لەبەر ئەوەی تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە، **دووەم:** (وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ) وە خوێنێك بە کەس و کاری کوژراوەکە بدرێت، (إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟) مەگەر کەس و کاری کوژراوەکە بیکەنە صەدەقەو بیبەخشن و خوێنی لێنەستێنن، (فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ) ئەگەر کوژراوەکە لە تیرەی خوانەناسانی دوژمنتان

بوو، بەلام موسلمان بوو ئەوە (ئەو کەسەی کە بە هەڵە کوشتویەتی) تەنها کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد دەکات، خوێنی نادرێ، (وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ) وە ئەگەر ئەو مرۆڤە ئیماندارە کوژراوە لە تیرەیەکی خوانەناسی هاوپەیمانتان بوو، ئەوە دەبێ تۆڵەی خوێنەکەی بە میراتگری کوژراوەکە بدرێت و بەندەیەکی باوەڕداریش ئازاد بکات، (فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ) جا هەر کەسێك بەندەی دەست نەکەوت (توانای کڕینی نەبوو، یان هەر نەمابوو، وەك ئێستا)، ئەوە دەبێت دوو مانگ بەبەردەوامی و بێ بەین تێکردن بە ڕۆژوو بێت (مەگەر نەخۆش بێت یان بەر ڕۆژانی جەژن بکەوێت)، (تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ) تا خوای پەروەردگار تەوبە لە بکوژەکە وەربگرێت، (وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا) خوای پەروەردگار زاناو کار بەجێیە دەزانێت چی فەرمان و بڕیارێك بۆ بەندەکانی چاکە.

**ئازاد کردنی بەندە بۆ کەفارەتی (الظّهار)** [*] : خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ ﴾ (المجادلة: ٣).

---

* الظّهار: ئەوەیە پیاوێك بە خێزانی بڵێت: تۆ وەکو دایکم وایت، یان وەکو پشتی دایکم وایت، واتە: چۆن دایکم لێم حەرامە تۆش بەهەمان شێوە، ئەگەر پیاوێك وای بە ژنەکەی ووت و پاشان پەشیمان بووەوە، ئەوە پێش ئەوەی بچێتە لای خێزانەکەی پێویستە یەکێك لەو کەفارەتانە بدات کە لە ئایەتەکەدا باسکراوە (واتە: نابێت جیماع لەگەڵ خێزانەکەیدا بکات تا کەفارەتی قسەی نەدات).

واتە: ئەوانەی لە ژنەکانیان (ظِهار) دەکەن، پاشان پەشیمان دەبنەوە لە قسەی خۆیان و دەیانەوێت بیان کەنەوە بە ژنی خۆیان، ئەو کەسە پێش ئەوەی ئەم کارە بکات، دەبێ کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، (واتە: ئەو موسڵمانە کاتێك (ظِهار) لە ژنەکەی دەکات و پاشان پەشیمان دەبێتەوە پێش ئەوەی بچێتە لای و جیماعی لەگەڵدا بکات پێویستە بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، (ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦ) ئەوەی خوا واجبی کردۆتە سەرتان لە ئازادکردنی بەندە ئامۆژگارییەکە بۆتان و ئامۆژگاریتانی پێدەکرێت تا جارێکی تر ئەو ووتانە بەدەمتاندا نەیەت، وە خوای پەروەردگاریش ئاگادارە بەو کارو کردەوانەی کە ئێوە دەیکەن.

ئەگەر ئەو موسڵمانەی کە (ظِهار)ی لە ژنەکەی کردووە و پاشان پەشیمان دەبێتەوە ئەوە پێش ئەوەی بچێتە لای خێزانی پێویستە بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، ئەگەر بەندەی دەست نەکەوت ئەوە دەبێت دوو مانگ لەسەر یەك و بێ بەین تێکردن بە ڕۆژوو بێت، خۆ ئەگەر نەیتوانی ئەوە دەبێت خواردنی شەست کەسی فەقیرو هەژار بدات.

**وە ئازادکردنی بەندە لە تۆڵەی کەفارەتی سوێند خواردندا**، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (المائدة: ٨٩ ).

واتـه: خـوا بـه سـوێندی سـەرزارەکی و بێمەبەسـت و بێنیـاز ناتـانگرێ و هیـچتان لەسـەر نانووسـێت، بـەڵام بـەو سـوێندانە دەتـانگرێ و لەسـەرتان دەنووسێت کە لـە دڵتانـەوە دێتـە دەرو ناشـیان بەنەسـەر، جـا هـەر کەسـێك سـوێندی نـاو دڵ بخـوات و نەیباتـە سـەر، یـان بـۆی نـەکرا، ئـەوە دەبێـت کەفارەتی بدات بەم شێوەیە: خـواردنی دە کەسـی فـەقیرو هـەژار بدات لـەو خۆراکە مام ناوەندییە کـە ئێـوە ڕۆژانـە بـە مـاڵ و منـداڵ و خێزانـی خۆتـانی دەدەن، یان دەبێ جل و بەرگی دە کەسی فەقیرو هەژار بکـەن، یـان دەبێـت کۆیلەیەك ئازاد بکەن، **جا هەر کەسێك ئەوانـەی نـەبوو ئـەوە دەبێـت سێ ڕۆژ بـە ڕۆژوو بێت**، ئەوەیە کەفارەتی ئەو سوێندانەی کە بە ئەنقەست خواردووتـانن و دەیان شکێنن، دەی کەوابوو سوێندەکانتان ڕاگرن و بیانپارێزن، بـە ناچـاری نەبێت مەیان شکێنن، ئا بەو شـێوەیە خـوا یاسـاکانی خـۆی ڕوون دەکاتـەوە بۆتان تا ئێوەش سوپاسگوزاری پەروەردگارتان بن.

**وە ئـازادکردنی کۆیلە وەکو کەفارەت بۆ ئەو کەسەی کە لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوومو جیماع لەگەڵ خێزانیدا دەکات**، هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبووین لە مەجلیسێك، پیاوێك هات و ووتی: ((يَا رَسُولَ اللَّه هَلَكْتُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): مَا لَكَ؟ قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): هَلْ تَجدُ رَقَبَةً تُعْتقُهَا؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابعَيْن؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَهَلْ تَجدُ إِطْعَامَ ستِّينَ مسْكينًا؟ قَالَ: لاَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، قَالَ أَبو هُرَيْرَةَ: فَبَيْنَا نَحْنُ عنْدَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إِذْ أُتِيَ بعَرَقٍ فيه تَمْرٌ وَالْعَرَقُ الْمكْتَلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): أَيْنَ السَّائلُ آنفًا؟ خُذْ هَذَا التَّمْرَ

فَتَصَدَّقْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنْ أَهْلِي يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَوَ اللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ)) [١٣٠].

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هیلاكدا چووم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چیتە بۆ بە هیلاك چووی؟ پیاوەكە وتی: لەگەڵ خێزانمدا جیماعم كرد لە كاتێكدا بە ڕۆژوو بووم (لە مانگی ڕەمەزاندا)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا كۆیلەیەك شك دەبەیت تا ئازادی بكەیت؟ پیاوەكە وتی: نەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بیت؟ پیاوەكە وتی: نەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا دەتوانی خواردنی شەست فەقیر بدەیت، پیاوەكە وتی: نەخێر، أبـــوهریرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) تۆزێك مایەوە سەبەتەیەك خورمای بۆهات، پاشان فەرمووی: كێ بوو ئەو كەسەی كە پێشتر پرسیاری كرد؟ پیاوەكە وتی من بووم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڕۆ ئەو سەبەتە خورمایە بەرەو بیكە بە خێر، پیاوەكە وتی: ئایا كەسێك هەیە لە من فەقیرتر بێت تا بیكەمە خێرو بیدەمێ؟ سوێند بە خوا لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕی شارماڵێك نییە لە ماڵی ئێمە هەژارتر بێت، پێغەمبەر (ﷺ) پێكەنی تا ددانی پیرۆزی دەركەوت، پاشان فەرمووی: بڕۆ ئەو سەبەتە خورمایە بكە خواردنی ماڵ و منداڵەكەت.

**وە ئازادكردنی بەندە بۆ كەسێك كە بەندەكەی ئازار دەدات**، زاذان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: چووم بۆ لای إبـــن عُمَـــر (خوایان لێ ڕازی بێت)

---

[١٣٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٠/٨٩)، والبخاري واللفظ له (١٩٣٦)، ومسلم (١١١١)، والترمذي (٧٢٤)، وأبو داود (٢٣٩٠)، وابن ماجه (١٦٧١).

بەندەیەکی ئازادکردبوو، چیلکەیەك یان شتێکی هەڵگرت و ووتی: ئازادکردنی ئەو بەندەیە بە ئەندازەی ئەو چیلکە دارە خێری تیا نییە، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی: ((مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ أَوْ ضَرَبَهُ فَكَفَّارَتُـهُ أَنْ يُعْتِقَهُ)) [131].

واتە: هەر کەسێك لە کۆیلەکەی داو ئەزیەتی داو بریندار کرد ئەوە کەفارەتەکەی ئازادکردنییەتی.

أبو مسعود الأنصاري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: کۆیلەیەکم هەبوو لێم داو ئەزیەتم دا، گوێم لە دەنگێك بوو لە پشتمەوە دەیووت: خوای پەروەردگار بەدەسەڵاتترە بەسەرتا لە دەسەڵاتی تۆ بەسەر ئەودا، کاتێك ئاوڕم دایەوە بینیم پێغەمبەرە (ﷺ)، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئازادبێت لە بەر خوا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((أَمَا لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَلَفَحَتْكَ النَّارُ أَوْ لَمَسَّتْكَ النَّارُ)) [132].

واتە: ئەگەر ئازادت نەدەکرد ئەوە شاڵاوی ئاگری دۆزەخ دەتی گرت، یان دەتی سووتاند (واتە: لە دوارۆژدا).

ئازادکردنی کۆیلە تەنها لەبەر خوای پەروەردگار، بێ هیچ کەفارەتێك خێرو پاداشتی یەکجار زۆری هەیە، وە خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ،

---

[131] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/١٤٩)، ومسلم واللفظ له (١٦٥٧)، وأبو داود (٥١٦٨).

[132] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/١٤٩)، ومسلم واللفظ له (١٦٥٩)، والترمذي (١٩٤٨)، وأبو داود (٥١٥٩).

عَمْـــرِو کـوڕی عَنْبَـــسَة (خـوای لـیّ ڕازی بیّـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً كَانَتْ فِدَاءَهُ مِنَ النَّارِ)) [١٣٣].

واتە: هەر موسڵمانێك کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات ئەوە بۆی دەبێتە ڕزگارکەری لە ئاگری دۆزەخ.

هەر بۆیە پیاوچاکانی پێشینی ئەم ئوممەتە پێشبڕکێیان کردووە لە ئازاد کردنی کۆیلە، تا خێرو پاداشتی گەورەی بەندە ئازادکردنیان دەست بکەوێت.

نافع (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: إبنُ عُمَر (خوایان لیّ ڕازی بێت) نەمرد تا هەزار یان زیاتر کۆیلەی ئازادکرد [١٣٤].

وە حَكيمِ کوڕی حِزام (خوای لیّ ڕازی بێت) لە سەردەمی جاهلیدا سەد کۆیلەی ئازاد کردووە، وە دوای موسڵمان بوونیشی سەد کۆیلەی تری ئازاد کردووە [١٣٥].

هاندانی ئیسلام و دەست پێشخەری موسڵمانان بۆ کۆیلە ئازاد کردن وای کرد کە کۆیلایەتی نەمێنێت، تا وای لێهاتووە موسڵمان کۆیلەیەك نابینێت تا ڕزگاری بکات ئەگەر یەکێك لەو کەفاراتانەی کەوتەسەر، یان بیەوێت خێری کۆیلە ئازاد کردنی دەست بکەوێت، ئەمەش ڕاستی فەرمودەی خوای پەروەردگاری پیّ دێتەدی کە لە چەند ئایەتێکدا دەفەرمووێت: ﴿فَمَن لَّمْ

---

[١٣٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/١٤٢)، والنسائي (٣١٤٢)، وأبو داود (٣٩٦٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٠٥٠).

[١٣٤] بڕوانە: صفة الصفوة لإبن الجوزي (١/٢٤٠).

[١٣٥] بڕوانە: صفة الصفوة لإبن الجوزي (١/٣١٣).

يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ﴾ (النساء: ٩٢)، وه ﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ﴾ (المائدة: ٨٩)، واته: ئەگەر كەسێك كۆیلەی نەبوو یان دەستی نەكەوت ئەوە با دوو مانگ لەسەر یەك و بێ بەین تێكردن بە ڕۆژوو بێت (لە كەفارەتی كوشتندا)، یان سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت لە كەفارەتی سوێند خواردندا (پاش ئەوەی ئەو كەسە سوێندی خواردووەو نایباتە سەرو دەیشكێنێت).

بەمەش بۆمان دەردەكەوێت ئیسلام یەكەم دینە كە كۆیلەی ئازاد كردووە بە هۆكاری زۆر سووك و ئاسان.

موسڵمانی خۆشەویست فەزڵ و بەرەكەتی خوای پەروەردگار زۆرە بەسەرمانەوە لە كاتێكدا بێبەشی نەكردووین لە خێرو پاداشتی كۆیلە ئازادكردن سەرەڕای نەبوونی یان ئەستەم دەست كەوتنی (لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا)، بەڵكو چەند كارێكی خێری بۆ داناوین بە كردنیان خێرو پاداشتی كۆیلە ئازاد كردنمان دەست دەكەوێت، ئەمەش واتای ڕزگار بوونە لە ئاگری دۆزەخ، بەڵام ئەم كارە خێرانە شوێنی كەفارەتی كوشتن و ظِهار و سوێند خواردن و...، ناگرێتەوە.

## ئەو كارە خێرانەی خێرو پاداشتی كۆیلە ئازاد كردنیان هەیە ئەمانەن

**یەكەم: سوڕانەوە بە دەوری كەعبەی پیرۆزدا (الطّواف):**

إبنُ عُبَيدِ كوڕی عُمَــير (خوایان لـێ ڕازی بێت) لـە باوكییـەوە دەگێڕێتـەوەو دەفەرمووێت: جارێكیان "عبدُالله كوڕی ئیمامی عُمَر"م بینـی (خوایـان لـێ ڕازی بێت) لە ڕووكنی (اليَمانِي) و ڕوكنـی (بەردەڕەشـەكە "الحَجَرُ الأَسْــوَد") زیـاد دەچووە پێشەوە، هیچ كات هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرم (ﷺ) نەبینیبوو بەو شێوەیە، منیش ووتم: ئەی باوكی عَبدالرَّحمن دەتبینم لە ڕوكنـی (اليَمــانِي) و ڕوكنی (بەردەڕەشەكە) زیاد دەچیتە پێشەوە، هـیچ كـات هـاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرم (ﷺ) نەبینیوە بەو شێوەیە، "عبدُالله كوڕی ئیمـامی عُمَر" (خوایـان لێ ڕازی بێت) فەرمووی: بۆیـە ئـەو كـارە دەكـەم، چـونكە گوێم لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی: ((إنَّ مَسْحَهُما كَفَّارَةٌ للخَطايا))، واتە: دەست هێنـان بە ڕوكنی (اليَمانِي) و ڕوكنی (بەردەڕەشەكە"الحَجَرُ الأَسوَد") دەبێتە هۆكاری لێخـۆش بـوون و سـڕینەوەی تاوانـەكان. وە گـوێم لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـووە فەرموویـەتی: ((مَنْ طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ أُسْبُوعًا فَأَحْصَاهُ كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ لا يَضَعُ قَدَمًا وَلا يَرْفَعُ أُخْرَى إِلَّا حَطَّ اللَّهُ عَنْهُ خَــطِيئَةً وَكَتَــبَ لَهُ بِهَا حَسَنَةً))[١٣٦].

---

[١٣٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٣/١٢)، والترمذي واللفظ له (٩٥٩)، والنسائي (٢٩١٩)، وابن ماجه (٢٩٥٦)، والحاكم (٤٨٩/١)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": صحيح لغيره (١١٣٩).

واته: هەر کەسێك بە دەوری ئەم بەیتەدا بسوڕێتەوە حەوت جار بێ کەم و زیاد، ئەوە خێرو پاداشتی کۆیلە ئازاد کردنێکی هەیە، وە ئەو کەسەی کە تەواف دەکات هیچ پێیەکی هەڵناگرێ و ئەوی تریان دانانێت ئیللا خوای پەروەردگار تاوانێکی پێ دەسڕێتەوەو خێرێکی بۆ دەنووسێت.

دەی کەوابوو ئەی موسڵمانی خۆشەویست کاتێك ڕێت کەوتە ئەو شوێنە پیرۆزە تەواف زۆر بکەو کاتت بە بازاڕو سەردانی شوێنێك مەکوژە کە لە سوننەتدا نەهاتووە، چونکە ئەو خێرە گەورەیەت لە دەست دەچێت و لە هیچ شوێنێکی سەر ڕووی زەوی دەستت ناکەوێت.

**دووەم: کردنی دوو ڕکات نوێژی سوننەت لە دوای تەواف کردن، وە هاتوو چۆی نێوان سەفاو مەڕوە:**

ئیمامی عُمَر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... وَأمّا ركعتاكَ الطَّوافَ، كَعِتْقِ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إسْمَاعِيلَ، وأمّا طَوافُكَ بَينَ الصَّفا وَالَمروَةِ بَعدَ ذلكَ كَعِتْقِ سَبعينَ رَقَبَة ...)) [137].

واتە: ... کردنی دوو ڕکات نوێژت لە دوای تەواف پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەیە لە نەوەی پێغەمبەر إسماعیل (عليه السلام)، وە هاتوو چۆی نێوان سەفاو مەڕوەت لە دوای ئەو دوو ڕکات نوێژە پاداشتی ئازاد کردنی حەفتا کۆیلەی هەیە ....

---

[137] رواه الطبراني، والبزار، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن لغيره (١١١٢).

هاتوو چۆی نێوان سەفاو مەروە ناکرێت بەبێ کردنی حەج و عومرە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کردنی حەج و عومرە خاوەنەکەی ڕزگار دەکات لە ناخۆشی و نارەحەتی ئاگری دۆزەخ کاتێك موسڵمان بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات.

**سێیەم: جیهاد کردن لە پێناو خوای پەروەردگاردا:**

عَمرِو کوڕی عَنبَسَة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ رَمَى الْعَدُوَّ بِسَهْمٍ فَبَلَّغَ سَهْمَهُ أَخْطَأَ أَوْ أَصَابَ فَعِدْلُ رَقَبَةٍ)) [١٣٨].

واتە: هەر موسڵمانێك تیرێك بهاوێت بۆ دوژمن و پێی بگات، بیپێکێت یان نا (بەر دوژمن بکەوێت و بیکوژێت یان نەیکوژێت)، ئەوە پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەیە.

وە هاوەڵی بەڕێز أبو نَجیح (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ عِدْلُ مُحَرَّرٍ)) [١٣٩].

واتە: هەر موسڵمانێك تیرێك بهاوێت لە پێناو خوای پەروەردگاردا ئەوە پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەیە.

---

[١٣٨] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٢/١٤)، وابن ماجه (٢٨١٢)، والحاكم (٢/٩٥)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (١٢٨٥).

[١٣٩] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧٧/٢١)، والترمذي (١٦٣٨)، والنسائي (٣١٤٣)، والحاكم (١٢١/٢)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٢٦٨).

موسڵمانی خۆشەویست لەم فەرموودانە ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە تیر هاویشتن بە نییەتی جیهاد کردن لە گەڵ کافراندا خێرو پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەی هەیە.

**چوارەم: یارمەتی دانی برای موسڵمانت، قەرز پێدانی، ڕێ پیشاندانی کەسێکی ڕێ لێ تێکچوو، یان کەسێکی نابینا:**

هاوەڵی بەڕێز براءِ کوڕی عازب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ مَنَحَ مِنْحَةَ وَرِقٍ أَوْ مِنْحَةَ لَبَنٍ أَوْ هَدَى زُقَاقًا فَهُوَ كَعِتَاقِ نَسَمَةٍ)) [١٤٠].

واتە: هەر موسڵمانێك قەرز بدا بە موسڵمانێك، یان "ووشترەکەی، مانگاکەی، مەڕەکەی..." بداتێ تا سوودی لێ ببینێت "شیرەکەی بدۆشێت" پاشان بۆی بگێڕێتەوە، یان ڕێنموونی کەسێکی ڕێ لێ تێکچوو بکات یان دەستی نابینایەك بگرێت، ئەوە خێرو پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەیە.

ئەم کارە خێرانە کە لابردنی ناخۆشی و ناڕەحەتی موسڵمانانە، بە کردنی هەر یەکێکیان خوای پەروەردگار خێرو پاداشتی ئازاد کردنی کۆیلەیەکت بۆ دەنووسێت.

**پێنجەم: خوێندنی ئەم زیکرە لە دوای نوێژی بەیانی و ئێوارە دە جار، (لا إِلَهَ إِلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ):**

---

[١٤٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٦٣/١٥)، والترمذي (١٩٥٧)، وابن حبان (٥٠٩٦)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٥٥٩).

هـاوەڵی بـەڕێز أبو أيــوب الأنــصاري (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر موسڵمانێك بەیانیان دە جار بڵێـت: ((لا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُــلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) ئـەوە: ((كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ وَاحِدَةٍ قَالَهَا عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَرَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا عَشْرَ دَرَجَاتٍ، وَكُنَّ لَهُ كَعِتْقِ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُنَّ لَهُ مَسْلَحَةً مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ إِلَى آخِرِهِ، وَلَمْ يَعْمَلْ يَوْمَئِذٍ عَمَلا يَقْهَرُهُنَّ، وَإِنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي فَمِثْــلُ ذَلِــكَ)) [١٤١].

واتە: هەر موسڵمانێك بەیانیان دە جار ئەم زیكرەی خوێنـد ئـەوە هـەر بـە یـەكجار ووتنـی (لا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَحْدَهُ ...) خـوای پـەروەردگار دە چـاكەی بـۆ دەنووسێت، وە دە خراپەی لەسەر لا دەبـات، وە دە پلـە بـەرزی دەكاتـەوە، وە دە جار ووتنی ئەو زیكرە خێرو پاداشتی ئازاد كردنـی دە كۆیلـەی هەیـە، وە خـوای پـەروەردگار ئـەو زیكرانـە بـۆ ئـەو موسـڵمانە دەكاتـە سـیلاح و پارێزەرێك لە بەیانی هەتا ئێوارە دەیپارێزێت، وە هیچ كەسێك چاكەی ناگاتە ئەو موسڵمانە مەگەر كەسێك بە وێنەی ئـەو یـان زیـاتری كردبێـت، وە ئەگـەر موسـڵمان ئێـوارەش دە جـار ئـەو زیكـرەی خوێنـد ئـەوە ئـەو هـەموو خێـرو چاكەیەی بۆ دەنووسرێت.

خوێندنی ئەم زیكرە بەیانیان دە جارو ئێواران دە جار خێرو پاداشتی ئازاد كردنی بیست كۆیلەی هەیە.

---

[١٤١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٤/٢٣٥)، والترمذي (٣٥٣٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٦٦٠).

**شەشەم: ووتنی ئەم زیکرە ڕۆژانە سەد جار،** ((لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)):

هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر موسڵمانێك ڕۆژی سەد جار بڵێت: ((لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) ئەوە ((كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ)) [١٤٢].

واتە: هەر موسڵمانێك ڕۆژی سەد جار ئەم زیکرەی خوێند ئەوە خێرو پاداشتی ئازاد کردنی دە کۆیلەی بۆ دەنووسرێت، وە سەد چاکەی بۆ دەنووسرێت، وە سەد تاوانی دەسڕدرێتەوە، وە بۆی دەبێتە پارێزەر لە شەیتان ئەو ڕۆژە تا ئێوارە، وە هیچ کەسێك نایات لە دواڕۆژدا بەوێنەی ئەو موسڵمانە خێرو چاکەی هەبێت، مەگەر موسڵمانێك ئەو زیکرەو کردەوەی چاکەی زیاتری کردبێت.

موسڵمانی ئازیز دەتوانیت سەد جار ئەم زیکرە بڵێیت لە چارەکە سەعاتێکدا، لە ناو سەیارەدا بیت، یان بۆ سەر کارەکەت بچیت، یان لە بازاڕ بیت، یان بۆ مزگەوت بچیت،......، جا ئەم هەموو خێرە لە دەست خۆت مەدە.

---

[١٤٢] رواه الإمام مالك (٤٨٦)، وأحمد "الفتح الرباني" (٢١٦/١٤)، والبخاري (٣٢٩٣)، ومسلم (٢٦٩١)، والترمذي (٣٤٦٨)، وابن ماجه (٣٧٩٨).

**حەوتەم: ووتنی ئەم زیکرانە سەد جار لە ڕۆژێکدا (اللهُ أكبَر، الحَمدُلله، سُبحانَ الله):**

هەر موسڵمانێك ئەم زیکرانە سەد جار بخوێنێت خێرو پاداشتی ئازاد کردنی سەد کۆیلەی بۆ دەنووسرێت، أمُّ هانئ (خوای لیٚ ڕازی بێت) دەفەرموویٚت: چووم بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ) پێم ووت: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پیر بوومەو بێتاقەت بوومە (واتە: ناتوانم هەموو کارێکی خێر بکەم) کارێکی چاکم پێ بڵێ (تا بە دانیشتنەوە بیکەم و شوێنی هەندێ عیبادەتم بۆ بگرێتەوە کە ناتوانم بیکەم)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((كَبِّري اللَّـهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، وَ احْمَدي اللَّهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، وَسَبِّحي اللَّهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، خَيْرٌ مِنْ مِائَة فَرَسٍ مُلْجَمٍ مُسْرَجٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَخَيْرٌ مِنْ مِائَة بَدَنَة، وَخَيْرٌ مِنْ مِائَة رَقَبَة)) [١٤٣].

واتە: سەد جار بڵێ (اللهُ أكبَر)، وە سەد جار بڵێ (الحَمدُلله)، وە سەد جار بڵێ (سُبحانَ الله)، ووتنی ئەمانە خێرترە لە ئامادەکردنی سەد ئەسپی لغاو کراو لە پێناو خوای پەروەردگاردا (بۆ جیهاد)، وە خێرترە لە بەخشینی سەد ووشتر، وە خێرترە لە ئازاد کردنی سەد کۆیلە.

نرخی ئازادکردنی سەد کۆیلە لە سەدان ملیۆن دینار زیاترە، هەر موسڵمانێك ئەم زیکرانە بڵێت ئەوە وەك ئەوە وایە ئەوەندە پارەیەی کردبێت بە خێرو قەلایەکی پۆڵایینی لە نێوان خۆی و ئاگردا دروست کردبێت کاتێك بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕوات.

---

[١٤٣] حسنه الشيخ الألباني في "صحيح سنن إبن ماجة" (١٢٥٢/٢، رقم:٣٨١٠).

## بەشی سێیەم:
## ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صراط) و ئەو کارانەی کە ڕوناکی دەکەنەوە

ناڕەحەتی و تاریکی سەر پردی (صِـــراط) زۆر زۆرە لە کاتێکدا ئەوەندە تاریکە موسڵمان هیچ نابینێت، مەگەر کەسانێك خوای پەروەردگار ڕوناکی پێ بەخشیبێتن و پردی (صِراط)ی بۆ ڕوناك کردبێتنەوە، لە پاداشتی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیادا کردوویانە، لە کاتێکدا ئاگری دۆزەخ ئەوەندە ڕەش و تاریکە تروسکەیەك ڕوناکی تێدا نییە، هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((أَتَحْسَبُونَ أَنَّ نَـــارَ جَهَنَّمَ مِثْلُ نَارِكُمْ هَذِهِ؟ هِيَ أَشَدُّ سَوَادًا مِنَ الْقَارِ، هِيَ جُزْءٌ مِنْ بِـــضْعَةٍ وَسِـــتِّينَ جُزْءًا مِنْهَا)) [١٤٤].

واتە: ئایا وا گومان دەبەن کە ئاگری دۆزەخ وەکو ئاگری دونیاتان وایە؟ نەخێر ئاگری دۆزەخ ڕەشترە لە قیر، ئاگری دونیا بەشێکە لە شەست و ئەوەندە بەشی ئاگری دۆزەخ (واتە: ئاگری دۆزەخ شەست و ئەوەندە جار ڕەشترو گەرمترو بە تینترە لە ئاگری دونیا).

هاوەڵی بەڕێز ثَـــوبان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێکیان لای پێغەمبەر (ﷺ) وەستابووم، زانایەك لە زاناکانی جولەکە هات و ووتی سەلامت لێبێت ئەی موحەممەد (ﷺ)، ثَـــوبان (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پاڵێکم پێوەناو ئەزیەتمدا، زانا جولەکە ووتی: بۆ پاڵم پێوە دەنێی؟ منیش

[١٤٤] صححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٦٦)، الجامع الصحيح للسنن والمسانيد (٣/ ٣٣٤)

ووتم: بۆ نالّێی ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش ووتی: ئێمە بانگی دەکەین بەو ناوەی کە ئەهلەکەی ناویان ناوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ناوم "مُحَمَّد"ـە، ئەهلەکەم بەو ناوە ناومیان ناوە، زانا جولەکەکە ووتی: بۆ ئەوە هاتووم بۆلات تا چەند پرسیارێکت لێ بکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جا هەر شتێکت بۆ باس بکەم سوودت پێدەگەیەنێت؟ جولەکەکە ووتی: گوێی لێدەگرم، پێغەمبەر (ﷺ) چیلکە دارێکی بە دەستەوە بوو لە زەوی دەخشاند، ووتی: پرسیار بکە، جولەکەکە ووتی: خەڵکی لە کوێن لەو ڕۆژەی کە ئاسمانەکان و زەوی دەگۆڕدرێن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هُمْ فِي الظُّلْمَةِ دُونَ الجِسْرِ) لە تاریکیدان لەسەر پردی (صِراط)، جولەکەکە ووتی: یەکەم کەس کێیە بەسەریا دەپەڕێتەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فُقَراءُ المُهاجِرين) فەقیرو هەژارە کۆچکردووەکانن، جولەکەکە ووتی: کاتێ دەچنە بەهەشتەوە چییان دەدرێتێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جەرگی حووت، جولەکەکە ووتی: دوای ئەوە چی خواردنێکیان دەدرێتی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يُنْحَرُ لَهُم ثَورُ الجَنَّةِ الّذي كانَ يَأكُلُ مِنْ أطْرافِها) گای بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕدرێت، کە لە دەورو پشتی بەهەشت دەلەوەڕێت، جولەکەکە ووتی: ئەی خواردنەوەیان چییە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مِنْ عَينٍ فيها تُسَمّى سَلْسَبيلاً) خواردنەوەیان لە کانی و چاوەیەکە پێی دەووترێت (السّلْسَبيل)، جولەکەکە ووتی: ڕاستە فەرمووی. کاتێك هاتم بۆلات و ئەو پرسیارانەتم لێ کرد، مەبەستم ئەوەبوو ڕاستی پێغەمبەرێتی (ﷺ) تۆم بۆ دەربکەوێت، چونکە هیچ کەس لەسەر رووی زەوی وەڵامی ئەم پرسیارانە نازانێت مەگەر پێغەمبەرێك (ﷺ)، یان پیاوێك، یان دوو پیاو، زانا جولەکەکە

ووتی: پرسیارێکی ترت لێدەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جا هەر شتێکت بۆ باس بکەم سوودت پێدەگەیەنێت؟ جولەکەکە ووتی: گوێی لێدەگرم، هاتووم پرسیاری مندالّت لێبکەم (واتە: ئایا پێش لە دایك بوونی دەزانرێت کوڕە یان کچە؟)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَـرْأَةِ أَصْفَرُ، فَإِذَا عَلاَ مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ تَعَالَى، وَإِذَا عَلاَ مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ).

واتە: ئاوی پیاو سپییەو ئاوی ئافرەتیش زەردە، ئەگەر هەردووکیان کۆبونەوە، ئاوی پیاوەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی ئافرەتەکەدا ئەوە مندالّەکە کوڕ دەبێت بە ویستی خوای پەروەردگار، وە ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی پیاوەکەدا ئەوە مندالّەکە کچ دەبێت بە ویستی خوای پەروەردگار، جولەکەکە ووتی: ڕاستت فەرموو بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت (ﷺ)، پاشان پشتی هەڵکردوو ڕۆیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لَقَدْ سَأَلَنِي هَذَا عَنِ الَّذِي سَأَلَنِي وَمَا لِي بِشَيْءٍ مِنْهُ عِلْمٌ حَتَّى أَتَانِي اللَّهُ بِـهِ)) (١٤٥).

واتە: کاتێك ئەو جولەکەیە پرسیاری ئەو شتانەی لێکردم، زانیاریم بە هیچیان نەبوو تا خوای پەروەردگار فێری کردم و ئاگاداری کردمەوە.

کاتێك ئاسمانەکان و زەوی دەگۆڕدرێن بە ئاسمان و زەوی تر، خەڵکی لە ناڕەحەتی و تاریکیدان لەسەر پردی (صِـراط)، هەروەك دایکی ئیماندارن خاتوو عائیشة لەم بارەیەوە فەرموودەیەکمان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ

---

(١٤٥) رواه الإمام مسلم (٣١٥)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (١ / ١٦٩، رقم: ٨٣٠)

دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ﴿٤٨﴾ ﴾ (إبراهيم: ٤٨).

واتە: لەو ڕۆژەدا کە قیامەتە ئاسمانەکان و زەوی دەگۆڕدرێت بۆ ئاسمان و زەوی تر. ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ڕۆژەدا خەڵکی لە کوێن؟ ئەویش فەرمووی: لەسەر پردی (صِراط)ن، لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی التّرمذي دەیگێڕێتەوە، فەرمووی: خەڵکی لەو ڕۆژەدا لە تاریکیدان لەسەر پردی (صِراط) [١٤٦].

لەوکاتەدا خوای پەروەردگار ڕوناکی بە ئیمانداران و دووڕووان دەبەخشێت، پێی دەڕۆن لەسەر پردی (صِـراط)، لە ناکاو "لەو تاریکی و ناڕەحەتییە" ڕوناکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە، تا بکەونە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ڕوناکی ئیمانداران دەمێنێتەوە بەڵام هەر کەس بە پێی کردەوەکانییەتی.

أبوالزُّبير (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ئاگام لێبوو پرسیار لە جابرِ کوڕی عبدُالله کرا (خوایان لێ ڕازی بێت) دەربارەی: (وَإنْ مِّنكُم إلاّ وارِدُها) ئەویش فەرمووی: لە دواڕۆژدا دێین، بانگی ئوممەتان دەکرێت بە پەرستراوەکانیانەوە (ئەوەی لە دونیادا پەرستوویانە) ئوممەت لە دوای ئوممەت، دوای ئەوە خوای پەروەردگار دێت بۆ لامان و پێمان دەڵێت: کێتان دەوێ و چاوەڕێی کێ دەکەن؟ موسڵمانان دەڵێن: چاوەڕێی پەروەردگارمان دەکەین، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: من پەروەردگارتانم، ئێمەش

[١٤٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٨٩/١٨)، ومسلم (٢٧٩١)، و الترمذي (٣١٢١)، وابن ماجه (٤٢٧٩)، والدارمي (٢٨٠٩)، وابن حبان (٣٣١)، والحاكم (٤٧٣/٢).

دەڵێین دەمانەوێ بتبینین، خوای پەروەردگار خۆی پیشانیان دەدات و پێدەکەنێت، خوای پەروەردگار دەیان بات و ئەوانیش شوێنی دەکەون، پاشان خوای پەروەردگار ڕوناکیان پێدەبەخشێت ئیماندار بن یان دووڕوو، ئەوانیش دوای ڕووناکییەکەیان دەکەون تا لەسەر پردی (صِراط) پێی بپەڕنەوە، لەسەر پردی (صِراط) قولاپ و دڕکی ئاگرینی لێیە ئەو کەسانە دەگرێت کە خوای پەروەردگار ویستی لێیە، پاشان ڕوناکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە، موسڵمانان لەسەر پردی (صِراط) دەپەڕنەوەو ڕزگاریان دەبێت، یەکەم کۆمەڵ کە دەپەڕنەوەو ڕزگاریان دەبێت دەم و چاویان درەوشاوەیە وەکو مانگ لە شەوی چواردەدا، حەفتا هەزار کەسن لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێت (سزا نادرێن)، پاشان کۆمەڵی دوای ئەوان کە دەپەڕنەوەو ڕزگاریان دەبێت وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان درەوشاوەن، پاشان کۆمەڵ کۆمەڵ بەو شێوەیە دەپەڕنەوەو ڕزگاریان دەبێت، پاشان شەفاعەت ڕێگە پێدەدرێت، موسڵمانان شەفاعەت دەکەن، بە هۆی شەفاعەتیانەوە کەسانێك لە ئاگری دۆزەخ دەردەکەن ووتویانە: (لا إلـه إلاّ الله)، وە لە دڵیاندا خێرو چاکە هەبووە بە ئەندازەی دەنکە جۆ، دەردەهێنرێن لە ئاگری دۆزەخ و لە دەوری بەهەشت دادەنرێن، ئەهلی بەهەشت ئاویان بەسەردا دەکەن، ئەوانیش دەگەشێنەوە (سووتاویان چاك دەبێتەوەو ڕەشێتیان نامێنێت) بە وێنەی دانەوێڵە چۆن ئاوی بەسەردا دەڕوات دەڕوێت و دەگەشێتەوە، ئەوانیش بەو ئاوە دەگەشێنەوە، پاشان ئەو موسڵمانانە بەردەوام داوای بەهەشت دەکەن تا خوای پەروەردگار بە

وێنەی دونیاو دە جار ئەوەندەی دونیا موڵکیان پێدەدات [147].

خوای پەروەردگار دیمەنی ئیماندارانمان بۆ باس دەکات کە لە ڕوناکیدا دەڕۆن، وە دیمەنی دووڕووانمان بۆ باس دەکات چۆن ڕوناکیان دەکوژێتەوەو داوا لە ئیمانداران دەکەن تا چاوەڕێیان بکەن و ئەمانیش بە هۆی ڕوناکی ئەوانەوە بتوانن لە تاریکی سەر پردی (صراط) ڕزگاریان بێت و بپەڕنەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾ (الحديد: ١٢ – ١٥).

واتە: ڕۆژی قیامەت پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەبینیی ڕوناکیەکەیان لەبەر دەم و لای ڕاستیانەوە دەدرەوشێتەوە، فریشتە پێیان دەڵێن: مژدەتان لێبێت ئەمڕۆ بە باخ و باخاتێك کە جۆگەو ڕووبار بە ژێر درەخت و کۆشکەکانیاندا دەڕوات، بە هەمیشەیی و هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە، بەڕاستی ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە، (يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ) لەو ڕۆژەدا پیاوانی دووڕوو و ئافرەتانی

---

[147] رواه الإمام أحمد "المسند"(١٤٧٦٣)، ومسلم موقوفا على جابر ﷺ (١٩١).

دووڕوو به ئیمانداران دەڵێن: چاوەڕوانیمان بکەن تا لە نووروو ڕوناکیەکەتان وەرگرین، (قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا) پێیان دەووترێ: بگەڕێنەوە بۆ دواوەتان (دونیا) و لەوێ ڕوناکی وەربگرن، (فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ) یەکسەر بەربەستێك (دیوارێك) دەخرێتە نێوان ئیمانداران و مونافیقەکان، دەرگایەکی تیایە، دیوی ناوەوەی ڕەحمەتی تیایە (ئەوەی لە ئیماندارەکانەوە دیارە)، لە دیوی دەرەوەشی سزای تیایە (ئەوەی لە مونافیقەکانەوە دیارە)، دوای ئەوە بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە، (يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ) مونافیقەکان بانگیان لێدەکەن و دەڵێن: باشە ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین "لە دونیا"، موسڵمانان دەڵێن: (بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ) بەڵێ بە ڕواڵەت لەگەڵمان بوون، بەلام ئێوە خۆتان تووشی دووڕوویی کرد، وە هەمیشە چاوەڕوانیتان دەکرد تا ئێمە توشی بەلا بین، وەك لە سورەتی (التَّوبَة)دا خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوائِر) خۆیان مەلاس دابوو تا زیان بە موسڵمانان بگەیەنن، (وَٱرۡتَبۡتُمۡ) وە هەمیشە لە دوو دڵی و گوماندا دەژیان بەرامبەر دینەکەی خوا، (وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ) وە هیواو ئارەزووی ناشیاو فریوی دابوون، تا فەرمانی خوا هات (مردن)، وە شەیتانی نەفرەت لێکراوو خراپەکاریش فریوی دابوون بەرامبەر فەرمانەکانی خوا، دەی کەوابوو (فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ) ئەمڕۆ هیچ فیدیەیەك لە ئێوەو ئەوانەی

کە بێ باوەڕبوون وەرناگیرێت، شوێن و جێگەتان ئاگری دۆزەخەو ئەوە شایستەترە پێتان، ئاگری دۆزەخیش خراپترین جێگای گەڕانەوەیە (بۆ بێباوەڕان و دووڕووان).

موسڵمانی خۆشەویست بیرکەوە لە داواکاری دووڕووەکان و وەڵامی موسڵمانان بۆیان ئەوەت بۆ دەردەکەوێت هاوڕێیەتی کردنی پیاوچاکان بە ئیمان و بە بەردەوامی چەندێ گرنگە، (يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ).

هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) لە تەفسیری ئایەتی (يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ ) دەفەرمووێت: موسڵمانان بە پێی کردەوەکانیان ڕوناکیان پێ دەدرێت، هەیانە ڕوناکییەکەی بە قەد شاخێکە، وە کەمترینیان ڕوناکییەکەی بەسەری پەنجەیەوەیەتی جارێك دەکوژێتەوەو جارێك ڕوناك دەبێتەوە [١٤٨].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: موسڵمانان بە پێی کردەوەکانیان بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن، هەیانە ڕوناکییەکەی بە قەد شاخێکە، وە هەیانە بە قەد دار خورمایەکە، وە کەمترینیان ڕوناکییەکەی بەسەری پەنجەوەیەتی جارێك ڕووناك دەبێت و جارێك دەکوژێتەوە [١٤٩].

کردەوە چاکەکانت دەبێتە ڕوناکی بۆت لەسەر پردی (صِراط)، پەیوەندی نێوان خێرا ڕۆیشتن و ڕوناکیت لەسەر پردی (صِراط) پەیوەندیەکی پێکەوە پەیوەستن، هەر کاتێك ڕوناکیت زۆر بوو ئەوە زوو بەسەر پردی (صِـــراط)دا

---

(١٤٨) رواه الحاكم (٢/٤٧٩)، وقال الذهبي في التلخيص: على شرط البخاري.

(١٤٩) أخرجه إبن جرير وإبن أبي حاتم، كما في البدور السافرة للسيوطي (ح ٩٩٣) (ص ٣٢٦)

دەپەڕیتەوە، بەڵام چەندێ ڕوناکیت کەم بێت ئەوە ڕۆیشتنت بەسەر پردی (صِراط)دا هێواش دەبێت، لەبەر ئەوەی هەردووکیان پەیوەستن بە کردەوە چاکەکانەوە، بیهێنە پێش چاوت ئەگەر پێت بووترێت بەشەو سەفەر بکە بۆ شوێنێك بە ئۆتۆمبیلەکەت، لە کاتێکدا ئۆتۆمبیلەکەت لایتەکانی بێهێزبن (ڕوناکی کەم بێت)، چەندێ کاتت پێویستە تا بگەیتە ئەو شوێنە، بێگومان زۆر، چونکە ڕوناکیت کەمەو زۆر لەسەر خۆ دەڕۆیت؟

بۆیە موسڵمانی خۆشەویست پێویستە لەم دونیایەدا پێشبڕکێ بکەیت بۆ کردنی کاری چاکە، تا ئەو کارە چاکانە کۆبکەیتەوە کە ڕوناکی سەر پردی (صِراط)ت زیاد دەکات، تا لەو گەشتە ترسناکە بتوانی بە سەلامەتی و خێرایی بڕۆیت، لە کاتێکدا نازانیت ئایا دەیبڕیت یان نا؟ باش بزانە هیچ کەس بەسەلامەتی پردی (صِراط) نابڕێت مەگەر کەسانی لە خوا ترس و ئەو کەسانەی کاری چاکە زۆر دەکەن و بە گەرم و گوڕی دینیان گرتووەو بەردەوامیان هەیە لەسەری.

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... والصِّراط كَحَدِّ السَّيْفِ دَحْضُ مَزِلَّةٍ، قَالَ: وَيَقُولُ: مُرُّوا، فَيَمُرُّونَ عَلَى قَدْرِ نُورِهِمْ، مِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَطَرْفِ الْعَيْنِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالْبَرْقِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالسَّحَابِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَانْقِضَاضِ الْكَوْكَبِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَالرِّيحِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَمُرُّ كَشَدِّ الرَّجُلِ وَيَرْمَلُ رَمْلاً، فَيَمُرُّونَ عَلَى قَدَرِ أعمَالِهِم، حَتَّى يَمُرُّ الذّي نُورُهُ عَلَى إبْهامِ قَدَمَيهِ، تَخِرُّ يَدٌ

وَتَعْلَقُ يدٌ، وتَخِرُّ رِجْلُ، وَتَعْلَقُ رِجْلٌ، فَـتُصِيبُ جَوَانِبَهُ النَّارُ)) [١٥٠].

واتـه: ... پـردی (صِــــراط) بـه وێنـەی دەمـی شمشێر تیژه، خلیسکەو پێیەکان لەسەری خۆی ناگرێت، دەفـەرمووێت: پێیـان دەووترێـت: بەسـەریدا بـڕۆن، خەڵکیش بە پێی ئـەو نـورو ڕوناکییـەی پێیـان بەخشراوه بەسـەریدا دەڕۆن، هەیانە بە خێرایی چاو تروکان بەسەریدا دەڕوات و دەپەڕێتـەوە، وە هەیانە بە خێرایی تیشك و بـە وێنـەی خێرایـی هـەور، وە هەیانـە بـە وێنـەی ئەستێرەکشان، وە هەیانـە بـە خێرایـی بـا، وە هەیانـە بـە وێنـەی ڕاکردنـی پیاوێك بە خێرایی، بە پێی کردەوەکانیان بەسەریا ئەپەڕنەوە، تا ئەگاتە ئـەو کەسەی کە نورو ڕوناکییەی بەسـەره پەنجەوەیـەتی (زۆر کەمـە)، دەسـتێکی دادەنێت و دەستەکەی تری هەڵدەگرێت، پێیەکی دادەنێت و پێیەکـەی تـری هەڵدەگرێت، ئاگر ئەملاو ئەولای ئەو موسڵمانە دەگرێت و دەیسووتێنێت.

هاوەڵی بەڕێز عبدُالله کـوڕی مَـسعود (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: خوای پەروەردگار لـە دواڕۆژدا هـەموو خـەڵکی کـۆ دەکاتـەوە، ....، پاشـان نورو ڕوناکیان بە پێی کردەوەکانیان دەدرێتێ، هەیانە زیاتر لـە کردەوەکـانی خـۆی ڕونـاکی پێدەدرێـت، وە هەیانـە بـە ئەنـدازەی دار خورمایـەك ڕونـاکی پێدەدرێـت بـە دەسـتی ڕاسـتیەوەیەتی، وە هەیانـە ڕونـاکی لـەوە کـەمتری پێدەدرێت، تا کۆتا کـەس ئەوەنـدە ڕوناکییەکـەی کەمـە بەسـەری پەنجـەی پێیەوەیەتی جارێك هەڵـدەبێت و جارێـك دەکوژێتـەوە، کاتێـك ڕونـاك دەبێـت هـەنگاوێك دەنێـت وە کاتێـك دەکوژێتـەوە لـە شـوێنی خـۆی دەوەسـتێت و

---

[١٥٠] رواه الحاكم واللفظ له (٤/٦٣٣)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٢٩).

ناتوانێت هەنگاو بنێت، ئەوها خەڵکی بەسەر پردی (صِراط)دا دەڕۆن، پردی (صِراط)یش بە وێنەی دەمی شمشێر تیژە، خلیسکەو پێیەکان لەسەری خۆی ناگرێت، دەفەرمووێت: پێیان دەووترێت: بەسەریدا بڕۆن، خەڵکیش بە پێی ئەو نورو ڕوناکییەی پێیان بەخشراوە بەسەریدا دەڕۆن، هەیانە بە خێرایی چاو تروکان بەسەریدا دەڕوات و دەپەڕێتەوە، وە هەیانە بە خێرایی تیشك و بە وێنەی خێرایی هەور، وە هەیانە بە وێنەی ئەستێرەکشان، وە هەیانە بە خێرایی با، وە هەیانە بە وێنەی ڕاکردنی پیاوێك بە خێرایی، بە پێی کردەوەکانیان بەسەریا دەپەڕنەوە، تا دەگاتە ئەو کەسەی کە نورو ڕوناکییەی بەسەرە پەنجەیەوەیەتی (زۆر کەمە)، کاتێك پەڕینەوەو ڕزگاریان بوو، دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگارمانی کرد لێت، دوای ئەوەی تۆی نیشان داین، بەڕاستی خوای پەروەردگار شتێکی پێبەخشیوین بە هیچ کەسێکی نەبەخشیوە [١٥١].

---

[١٥١] رواه الحاكم (٢/٤٠٨)، والبيهقي، وصححه الألباني في تخريج أحاديث العقيدة الطحاوية (صفحة ٤٧٠).

## ئەو كارە چاكانەی كە نورو ڕوناكی موسڵمان زیاد دەكات لەسەر پردی (صراط)

شەرعی پیرۆز زۆر كارو كردەوەی چاكی بۆڕوون كردوینەتەوە كە نورو روناكی موسڵمان زیاد دەكات لەسەر پردی (صِراط)، وە هەر كاتێك موسڵمان ڕوناكی زۆر بێت لە دواڕۆژدا ئەوە خێرایی لەسەر پردی (صِراط) زیاد دەبێت.

**ئەو كردەوە چاكانە ئەمانەن:**

**١. كردنی پێنج نوێژە فەرزەكان بە گشتی و نوێژی بەیانی بە تایبەتی:**

هاوەڵی بەڕێز عَبدالله كوڕی عَمْرو كوڕی العاص (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی نوێژی كردوو فەرمووی: ((مَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا، كَانَتْ لَهُ نُوراً وَبُرهَاناً وَنَجَاةً يَوْمَ الْقِيَامَة، وَمَنْ لَمْ يُحَافظ عَلَيْهَا، لَمْ يَكُنْ لَهُ نُوراً وَلاَ بُرهَناً وَلاَ نَجَاةً، وَكَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ قَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَأُبِيَّ بن خَلَفْ)) [١٥٢].

واتە: هەر موسڵمانێك پارێزگاری لە نوێژەكانی بكات (لە كاتی خۆیدا بیان كات و بەردەوام بێت لەسەر كردنیان)، ئەوە نوێژەكانی بۆی دەبنە نورو ڕوناكی و بەڵگەی سەرفرازی و ڕزگار بوون لە دواڕۆژدا، وە هەر موسڵمانێك

---

[١٥٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢/٢٣٢)، وابن حبان وصححه (١٤٦٧)، والدارمي (٢٧٢١)، والبيهقي، والهيثمي في مجمع الزوائد وقال: رجال أحمد ثقات (١/٢٩٣)، وقال المندري في الترغيب والترهيب: رواه أحمد بإسناد جيد (١/٣٨٦)، وصححه الألباني في "مشكاة المصابيح" (٥٧٨)، ثم ضعفه في "التعليقات الحسان على صحيح إبن حبان" (١٤٦٥).

پارێزگاری له نوێژەکانی نەکات، ئەوە لە دوارۆژدا نورو ڕوناکی و بەڵگەی سەرفرازی و ڕزگار بوونی نییە، وە ئەو کەسە لە قیامەتدا لەگەڵ (قارون و فِرعَون و هامان و أُبَيّ کوڕی خَلَف) حەشر دەکرێت (خوا پەنامان بدات).

وە هاوەڵی بەڕێز أبو موسى الأشعري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الطّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لله تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لله تَمْلآنِ مَا بَيْنَ السّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصّلاَةُ نُورٌ، والصّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا)) [١٥٣].

واتە: دەست نوێژ نیوەی ئیمانە، یان دەست نوێژ نیوەی نوێژە، (یان خۆ پاککردنەوە نیوەی ئیمانە، چونکە ئیمان دوو بەشە: بەشێکیان پاککردنەوەی دڵ و دەروونە لە شیرك و كوفرو دووڕوویی و ....، وە بەشەکەی تری پاککردنەوەی لاشەیە لە لەشگرانی و بێدەست نوێژی و پیسیەکانی تر)، وە ووتنی زیکری (الحَمْدُ لله) ترازووی چاکەت پڕ دەکات، وە ووتنی زیکری (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لله) نێوان ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکات لە چاکە، وە نوێژ نورو ڕووناکییە، وە صەدەقە (زەکات و خێرکردن) بەڵگەی ئیمانی ئەو کەسەیە تا پاداشتی لەسەر وەربگرێت لە دوارۆژدا، چونکە کافرو موشریك و دووڕوو باوەڕیان بە پاداشتی صەدەقە نییە، وە ئارامگرتن (لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەرو (ﷺ) نەکردنی خراپە) ڕوناکییە،

---

[١٥٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٧)، ومسلم (٢٢٣)، والترمذي (٣٥١٧)، والنسائي (٢٤٣٧)، وابن ماجه (٢٨٠)، وابن حبان (٨٤٤)، والدارمي (٦٥٣).

وە قورئانی پیرۆز بەڵگەی ڕزگار بوونتە (ئەگەر کارت پێ کردبێت)، یان بەڵگەیە لەسەر لەناو چوونت (ئەگەر پشت گوێت خستبێت و کارت پێنەکردبێت)، هەموو خەڵکی هەوڵ دەدات و کۆشش دەکات، هەیانە نەفسی دەفرۆشێت بە خوای پەروەردگار (گوێڕایەڵی دەکات) و نەفسی ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ، وە هەیانە لەناوی دەبات (بە فرۆشتنی بە شەیتان و شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوی).

زانای پایەبەرز إبـنُ رجَـب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا ووتوویەتی: (وَالصّلاَةُ نُورٌ): بەڵێ نوێژ نورو ڕوناکی ئیماندارانە لە تاریکاییەکانی قیامەتدا، نورو ڕوناکیان بە پێی کردەوەکانیان پێدەدرێت [١٥٤].

هەر لەبەر قورسی نوێژی بەیانییە لەسەر نەفس کە خوای پەروەردگار هانی موسڵمانانی داوە تا بە جەماعەت و لە کاتی خۆیدا بیکەن، هەر موسڵمانێك بەردەوام بیکات خوای پەروەردگار پاداشتێکی بۆ داناوە کە لە نوێژەکانی تردا بەدی ناکرێت (ئەویش نورو ڕوناکی تەواوە لەسەر پردی (صِراط)، هەروەك هاوەڵی بەڕێز أَنَسِ کوڕی مالك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بَشِّرْ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) [١٥٥].

---

[١٥٤] بڕوانە: جامع العلوم والحكم لابن رجب الحنبلي، تحقيق شعيب الأرناؤوط وإبراهيم باجس (٢/٢٣).

[١٥٥] رواه الترمذي (٢٢٣ )، وأبو داود (٥٦١)، وابن ماجه (٧٨١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٢٨٢٣).

واتە: مژدە بێت بە نورو ڕوناکی تەواو لە قیامەتدا بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لە تاریکایی شەودا دەکەونە ڕێ و بە پێ دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان (بۆ کردنی نوێژی جەماعەت).

زانای پایەبەرز ئیمامی السّندي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئەم فەرموودیە نوێژی عیشاو بەیانی دەگرێتەوە، چونکە هەردووکیان لە تاریکایی شەودا دەکرێت[156].

ئەگەر ئافرەتێك مێردو منداڵەکانی خەبەر بکاتەوەو هانیان بدات بۆ ئەوەی بچن بۆ کردنی نوێژی عیشاو بەیانی بە جەماعەت، ئۆمێدە ئەو نورو ڕوناکییە تەواوەی بدرێتێ لە دواڕۆژدا، چونکە هەرکەسێك یارمەتی دەری کەسێك بێت لە کردنی کاری چاکە (یان خراپە)، ئەوە بە ئەندازەی ئەو کەسەی کە هانی داوە یان یارمەتی داوە خێر (یان خراپەی) بۆ دەنووسرێت.

**٢. کردنی نوێژی جومعە بە ئادابەکانی، وە بانگدان تەنها بۆ ڕازی بوونی خوا:**

هاوەڵی بەڕێز أبو موسی الأشعري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ الأَيَّامَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى هَيْأَتِهَا، وَيَبْعَثُ الْجُمُعَةَ زَهْرَاءَ مُنِيرَةً، أَهْلُهَا يَحُفُّونَ بِهَا كَالْعَرُوسِ تُهْدَى إِلَى كَرِيمِهَا تُضِيءُ لَهُمْ، يَمْشُونَ فِي ضَوْئِهَا، أَلْوَانُهُمْ كَالثَّلْجِ بَيَاضًا، وَرِيحُهُمْ يَسْطَعُ

---

(156) بڕوانە: شرح سنن ابن ماجه القزويني لأبي الحسن الحنفي المعروف بالسندي (١/٢٦٢).

كَالْمِسْكِ، يَخُوضُونَ فِي جِبَالِ الْكَافُورِ، يَنْظُرُ إِلَيْهِمُ الثَّقَلانِ لاَ يُطْرِقُونَ تَعَجُّبًا حَتَّى يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، لاَ يُخَالِطُهُمْ أَحَدٌ إِلاَّ الْمُؤَذِّنُونَ الْمُحْتَسِبُونَ)) (١٥٧).

واتـه: خـواى پـەروەردگار لـە دوارۆژدا ڕۆژەكـان لەسـەر شـێوەى خـۆيان دێنێـت، وە ڕۆژى هـەينيش دێنێـت كـە زۆر ڕونـاك و درەوشـاوەيە، ئـەهلى جومعە (ئەو موسڵمانانەى ئامادەى نوێژى جومعەو ووتـارى جومعـە بوونـە)، دەورى دەدەن (بە وێنـەى بوكێك ڕازێندرابێتـەوە بـۆ مێردەكـەى)، ئەوەنـدە جـوان و درەوشـاوەيە، ئـەوانيش بـە هـۆى ڕوناكييەكەيـەوە دەكەونـە ڕێ، ڕوويان وەكو بەفرى سپى درەوشاوەيە، بـۆنێكى خۆشـيان لێـدێت بـە وێنـەى بـۆنى خۆشـى ميسك، دەچـنە نـاو كێـوى بـۆن خۆشـى كـافورەوە، مرۆڤــ و جنۆكەكان سەيريان دەكەن و چاويان ناتروكێنن و سەيرى ئەملاو ئەولا ناكەن سەرسامن بەو ئەجرو پاداشت و ڕێزە گەورەيەيان لاى خواى پەروەردگار، تـا دەچـنە بەهەشـتەوە، هـيچ كەسـێك تێكـەڵيان نابێـت و لەگەڵيانـدا ناچـێتە بەهەشتەوە مەگەر تەنها ئەو بانگ بێژانەى كـە لەبـەر خـواى گـەورە بانگيـان دابێـت، بـە نييـەتى وەرگرتنـى ئـەجرو پاداشـت لـە دوارۆژدا (تـەنها بـۆ ڕازى بوونى خوا بانگيان داوە، بێئەوەى چاويان لە پاداشتى خـەڵكى بووبێـت، وە نييەتيشيان تەنها بۆ خوا بووە).

(١٥٧) رواه الحاكم (١/٢٧٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (١٨٧٢).

**٣. دەرکردنی زەکات:**

هاوەڵی بەڕێز أبو موسى الأشعري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: فەرموویەتی: ((الطَّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، ......، والصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، .... )) [158].

واتە: دەست نوێژ نیوەی ئیمانە، یان دەست نوێژ نیوەی نوێژە، (یان خۆ پاککردنەوە نیوەی ئیمانە، چونکە ئیمان دوو بەشە بەشێکیان پاککردنەوەی دڵ و دەروونە لە شیرك و کوفرو دووڕوویی و ...، وە بەشەکەی تری پاککردنەوەی لاشەیە لە لەشگرانی و بێدەست نوێژی و پیسیەکانی تر)، .......، وە صەدەقە (زەکات و خێرکردن) بەڵگەی ئیمانی ئەو کەسەیە تا پاداشتی لەسەر وەربگرێت لەسەری لە دواڕۆژدا چونکە کافرو موشریك و دووڕوو باوەڕیان بە پاداشتی نییە، ....).

**٤. ئارامگرتن لەسەر قەدەری خوای پەروەردگار:**

هاوەڵی بەڕێز أبو موسى الأشعري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: فەرموویەتی: ((الطَّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، .....، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، ..... )) [159].

واتە: دەست نوێژ نیوەی ئیمانە،......، وە ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خواو پێغەمبەر (ﷺ)، وە نەکردنی خراپە، وە تووش بوون بە ناخۆشی و ناڕەحەتی و نەبوونی، ......، نورو ڕوناکییە لە دواڕۆژدا،....).

---

[158] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٧/١٩)، ومسلم (٢٢٣)، والترمذي (٣٥١٧)، والنسائي (٢٤٣٧)، وابن ماجه (٢٨٠)، وابن حبان (٨٤٤)، والدارمي (٦٥٣).

[159] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٧/١٩)، ومسلم (٢٢٣)، والترمذي (٣٥١٧)، والنسائي (٢٤٣٧)، وابن ماجه (٢٨٠)، وابن حبان (٨٤٤)، والدارمي (٦٥٣).

ئارامگرتن: واته: گرتنەوەی نەفس لە دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر ئەو شتانەی کە تووشت دەبێت و (بەویستی خوای پەروەردگار) پێت ناخۆشە، ئارامگرتن نیوەی ئیمانە، دەی کەوابوو پێویستە ئارام بگرین لەسەر قەدەری خوای پەروەردگار، لەسەر گوێڕایەڵی خوا، لەسەر تاوان نەکردن، لە کاتی تووش بوون بە ناخۆشی و ناڕەحەتی و نەبوونی، ......، تا ئەو نورو ڕوناکییە گەورەیەمان لەدەست نەچێت لە تەنگانەو ناڕەحەتی سەر پردی (صراط).

**٥. خوێندنی سورەتی "کَهْف" لە ڕۆژی جومعەدا:**

هاوەڵی بەڕێز أبو سعيد الخدري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنْ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ)) [١٦٠].

واتە: هەر موسڵمانێك سورەتی "کَهْف" بخوێنێت لە ڕۆژی جومعەدا، ئەوە بۆی دەبێتە نورو ڕوناکی تا جومعەی داهاتوو (ڕۆژانی نێوان هەردوو جومعەکەی بۆ ڕوناك دەکاتەوە)، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ((مَن قَرَأَ سُورَةَ اَلْكَهْفِ كَمَا أُنْزِلَتْ، كَانَتْ لَهُ نُورًا مِنْ مُقَامِهِ إِلَى مَكَّةَ)).

واتە: هەرکەسێك سورەتی "کَهْف" بخوێنێت لە ڕۆژی جومعەدا بەو شێوەیەی کە دابەزیوە، ئەوە بۆی دەبێتە نورو ڕوناکی لەو شوێنەی کە خوێندوویەتی تا شاری مەککە.

---

[١٦٠] رواه الحاكم (١/٧٥٢)، والدارمي (٣٤٠٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٤٧٠).

### ٦. خوێندنی سورەتی "البَقَرَة وَ آلِ عِمْران" بەبەردەوامی:

هاوەڵی بەڕێز أبو أمامة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إقْرَءُوا الْقُرْآن فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْم الْقِيَامَة شَفِيعًا لأَصْحَابه، اقْرَءُوا الزهراوين: الْبَقَرَة و سُورَة آل عمرَان، فَإِنَّهُمَا يأتيان يَوْم الْقِيَامَة كَأَنَّهُمَا غمامتان، أَو كَأَنَّهُمَا غيايتان، أَو كَأَنَّهُمَا فِرقان مِنْ طَيرٍ صَواف يُحاجّان عَن صَاحِبِهِمَا، اقْرَءُوا سُورَة الْبَقَرَة؛ فَإِنْ أَخذهَا بركَة، وَتركهَا حَسْرَة، وَلا يَستَطيعُها البَطَلَة)) [١٦١].

واتە: موسڵمانان قورئان بخوێنن چونکە قورئان لە دوارۆژدا شەفاعەت دەکات بۆ خاوەنەکەی (ئەو موسڵمانەی تەنها لەبەر خوا قورئان خوێن بووە)، وە ئەو دوو سورەتە ڕۆشن و پرشنگدارە بخوێنن (کە سورەتی "بَقَرَة و آل عِمْـــران"ـە، لەبەر ئەوەی هیدایەتی تیایە بۆ ئەو کەسەی کە دەیانخوێنێت، یان نورو ڕوناکی دەبەخشن بە خوێنەرەکەی لە دوارۆژدا، چونکە ئەو دوو سورەتە لە دوارۆژدا دێن بە وێنەی دوو پەڵە هەور، یان بە وێنەی دوو کۆمەڵ باڵندەی زۆر، سێبەرو شەفاعەت بۆ خاوەنەکانیان دەکەن، سورەتی "بَـــقَرَة"بخوێنن، چونکە خوێندن و دەست پێوە گرتنی بەرەکەتی تیایە، وە پشت گوێ خستن و نەخوێندن و کارپێنەکردنی پەشیمانی لە دوایە، وە هەر کەسێك بیخوێنێت سیحرو ساحیران پێی ناوێرن و کاری لێناکەن.

---

[١٦١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٨/٦٩)، ومسلم (٨٠٤).

زانای پایەبەرز ئیمامی المُناوي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە مانای ووشەی "الزّهراوَين"دا دەڵێت: ئەم دوو سورەتە ڕۆشن و پرشنگدارو ڕوناککەرەوەن، لەبەر زۆری ڕوناکی حوکمە شەرعیەکان و زۆری ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار کە لەم دوو سورەتەدا هەیە، یان هیدایەتی تێدایە بۆ ئەو کەسەی کە دەیانخوێنێت، یان نورو ڕوناکی دەبەخشن بە خوێنەرەکەی لە دواڕۆژدا [١٦٢].

موسڵمانی خۆشەویست ئەم فەرمودە پیرۆزە هانمان دەدات بۆ لەبەر کردن و خوێندنی ئەم دوو سورەتە پیرۆزە بەبەردەوامی.

### ٧. فێربوونی قورئانی پیرۆزو لەبەرکردنی:

هاوەڵی بەڕێز بُرَيــدَةَ (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَتَعَلَّمَهُ وَ عَمِلَ بِهِ، أُلْبِسَ وَالِدَاهُ تَاجاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نُورٍ، ضَوْءُهُ مِثْلُ ضَوْءِ الشَّمْسِ، وَيُكسَى والداهُ حُلَّتَينِ لا يَقومُ لَهُما الدُّنيا، فَيَقولانِ: بِمَ كُسِينا هذا؟ فَيُقالُ: بِأَخْذِ وَلَدِكُما القُرآنَ)) [١٦٣].

واتە: هەر موسڵمانێك قورئان بخوێنێت و خەڵکی فێر بکات و خۆشی کاری پێ بکات، لە دواڕۆژدا تاجی نورو ڕوناکی دەکرێتە سەر دایك و باوکی، ڕوناکی ئەو تاجە بەوێنەی ڕوناکی خۆرە، وە جل و بەرگێك دەکرێتە بەریان کە هەموو دونیا پێی ناگات و بە وێنەی ئەو تاجە بە نرخ نین، ئەوانیش

---

[١٦٢] بڕوانە: فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (٢/٦٣).

[١٦٣] رواه الحاكم (١/٧٥٦)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن لغيره (١٤٣٤).

دەڵێن: بەچی ئێمە ئەم جل و بەرگە جوان و بەنرخە کرایە بەرمان؟ پێیان دەووترێت: بە دەست گرتنی کوڕەکەتان بە قورئانی پیرۆزە (دەیخوێندو خەڵکی فێر دەکردو کاری پێ دەکرد).

جا هەر موسڵمانێك دەیەوێت چاکە لەگەڵ دایك و باوکیدا بکات و سەرفرازیان بکات، ئەوە با قورئانی پیرۆز لەبەر بکات، موسڵمانی خۆشەویست ئەگەر خوای پەروەردگار ئەو ڕێزو کەرامەتە بە دایك و باوکی قورئان خوێن ببەخشێت؟ ئەی ئەو کەسەی کە قورئانی لەبەرەو خەڵکی فێر دەکات و خۆشی کاری پێ دەکات، دەبێ خوای پەروەردگار چەندێ ڕێزداری بکات و پلەو پایەی بەرز بکاتەوە.

### ٨. تێکۆشان لە پێناو خوای پەروەردگار:

تێکۆشان و جەنگان لە پێناو خوای پەروەردگاردا نورو ڕوناکی دەبەخشێت بە خاوەنەکەی لە دوارۆژدا، هاوەڵی بەڕێز أبـوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، كَانَ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[١٦٤].

واتە: هەر موسڵمانێك تیرێك بهاوێت لە پێناو خوای پەروەردگار (بۆسەرکەوتنی دینەکەی)، ئەوە ئەو تیر هاویشتنەی بۆ دەبێتە نورو ڕوناکی لە دوارۆژدا.

---

[١٦٤] رواه البزار، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": صحيح لغيره (١٢٩٢).

شـەهیدان نـورو ڕوناکیـان بۆهەیـە لای خـوای پـەروەردگار لـە دواڕۆژدا، هەروەك خوای پەروەردگار دەفـەرموویّت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ ١٩﴾ (الحديد: ١٩).

واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە خواو بە پێغەمبـەرانی (صـەلات و سـەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەوانە پلەی ڕاستگۆییان وەرگرتـووە، وە شـەهیدەکانیش پاداشت و ڕوناکی خۆیان هەیە لە دواڕۆژدا.

زانای پایەبـەرز ئیمـامی الطَّبَري (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتەدا دەڵێت: شەهیدان ئەو کەسانەن کە لە پێنـاوی خـوای پـەروەردگاردا شەهید کـراون، یـان لـە پێنـاو ئـەودا لـە نـاو چـوون، ئـەو کەسـانە پاداشـتی گەورەو نورو ڕوناکی زۆریان بۆهەیە [١٦٥].

موسڵمانی خۆشەویست داوا لە خوای پەروەردگار بکـە تـا پلـەی شـەهیدیت پێ ببەخشێت، چونکە هەرکەسێك لە دڵەوەو بەڕاستی داوای شـەهیدی بکـات لە خوای پەروەردگار، ئەوە خوای پەروەردگار پێـی دەبەخـشێت ئەگـەر ئـەو کەسە لە ساحەی جیهادیشدا شەهید نەبێت، هـەروەك هـاوەڵی بـەڕێز سَـــهلِ کوڕی حُنَیف (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ)) [١٦٦].

---

[١٦٥] بڕوانە: مختصر تفسير الطبري للصابوني (٤٢٧/٢).

[١٦٦] رواه الإمام مسلم (١٩٠٩)، وأبو داود (١٥٢٠)، والترمذي (١٦٥٣)، والنسائي (٣١٦٢).

واتە: هەر موسڵمانێك لە دڵەوەو بەڕاستی داوای شەهیدی بکات لە خوای پەروەردگار، ئەوە خوای پەروەردگار پێی دەبەخشێت و دەیگەیەنێت بە پلەی بەرزی شەهیدان، ئەگەر ئەو کەسە لەسەر جێگەکەی خۆشی بمرێت.

### ٩. داد پەروەری و زوڵم نەکردن:

هاوەڵی بەڕێز جابرِ کوڕی عَبدُالله (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إتَّقوا الظُّلم؛ فَإن الظُّلمَ ظلمات يَوْم الْقِيَامَة، وَاتَّقوا الشُّح؛ فَإن الشُّح أهلك من كَانَ قبلكُمْ، حملهمْ على أَن سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمهمْ)) [١٦٧].

واتە: خۆتان بپارێزن لە زوڵم و ستەم کردن، چونکە ستەم کردن تاریکاییە لە دوارۆژدا، وە خۆتان بپارێزن لە بەخیلی و ڕەزیلی، چونکە بەخیلی و ڕەزیلی گەلانی پێش ئێوەی لەناو بردوو بە هیلاکی بردن، وای لێکردن تا خوێنی یەکتری بڕێژن، وە وای لێکردن کە ئافرەتانیان حەڵاڵ بکەن، یان ئەو ماڵەی کە خوای پەروەردگار حەرامی کردبوو حەڵاڵیان کرد [١٦٨].

زانای پایەبەرز ئیمامی النَّووي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی القاضي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ووتراوە: فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە زوڵم و ستەم کردن دەبێتە تاریکایی لەسەر ستەمکاران،

---

[١٦٧] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٣٥)، والبخاري (٢٤٤٧)، ومسلم واللفظ له (٢٥٧٨)، والترمذي (٢٠٣٠)، والدارمي (٢٥١٦)، والحاكم (١/٥٦).

[١٦٨] بڕوانە: التيسير بشرح الجامع الصغير،للإمام الحافظ زين الدين عبد الرؤوف المناوي، (١/٥٨).

کەسی ستەمکار لە دواڕۆژدا ناتوانێت هیچ ڕێگەیەك بگرێتەبەر بۆ ئەوەی تاریکاییەکانی سەر پردی (صِراط)ی بۆ ڕوناك بێتەوە، لە کاتێکدا ئیمانداران نورو ڕوناکی لە بەردەم و پشتیانەوە هەیە [١٦٩].

ئەگەر زوڵم و ستەم ببێتە تاریکی لە دواڕۆژدا، ئەوە دادپەروەری دەبێتە نورو ڕوناکی بۆ خاوەنەکەی لە دواڕۆژدا، لە کاتێکدا فەرمانمان پێکراوە کە دادپەروەر بین لە نێوان خەڵکیدا، هەتا لە نێوان منداڵەکانمدا، بگرە لەسەر نەفسی خۆشمان، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ (المائدة: ٨ ).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، هەمیشە هەوڵ بدەن لەبەر خوا دادگەرو ڕاستگۆ بن و پابەندی هەموو بڕیارو فەرمانەکانی خوا بن، بە دادپەروەرانە شایەتی بدەن و بە لای هیچ لایەکدا دایمەبڕن، تەنانەت ئەگەر منداڵەکانیشتان بن، ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ﴾ وە ڕق و کینەو دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك واتان لێنەکات کە بە دادپەروەرانە ڕەفتار نەکەن، ﴿ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾ دادگەر بن (هەرچەندە ئەوان نا عەدالەت و ناڕێکیش بن)، چونکە بێگومان ڕەفتاری دادگەریی و یەکسانی بە تەقواوە نزیکترەو پارێزگاری سنورەکانی خوای پێدەکرێت، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ

---

[١٦٩] بڕوانە: صحيح مسلم بشرح النووي (١٦/٣٧٠).

ﭐللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ وه تەقوای خوا بکەن و لەو بترسن، چونکە بەڕاستی ئێوە هەر کارێك بکەن خوای پەروەردگار ئاگادارە لێی.

**١٠. بەرد هاویشتنی شەیتان ڕەجم کردن (رَمي الجمار):**

هاوەڵی بەڕێز إبنُ عَباس (خوایان لیٚ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إذا رَمَيْتَ الجِمارَ كانَ لَكَ نُوراً يَوْمَ القِيامَةِ)) (١٧٠).

واتە: کاتێك شەیتانت ڕەجم کرد، ئەوە بۆت دەبێتە نورو ڕوناکی لە ڕۆژی دواییدا (کاتێك حاجی لە ڕۆژی یەکەم ودووەم و سێیەمی جەژن لە مینا دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی کە شەیتان هاتە ڕێی پێغەمبەر إبراهیم (عليه السلام) تا ڕێی لێبگرێت، ئەویش حەوت بەردی تێگرت و شەیتانیش خۆی شاردەوە، بۆیە بەو کارە ئەووترێت "رَميُ الجِمار"، بەرد هاویشتن، نەك شەیان ڕەجم کردن.

**١١. سەرتاشین لە حەج:**

هاوەڵی بەڕێز إبن عُمَر (خوایان لیٚ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... وَإذا حَلَقَ رَأْسَهُ، فَلَهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَقَطَتْ مِنْ رَأْسِهِ نُورٌ يَومَ القيامَةِ، وَإذا قَضَى آخِرَ طَواف بِالبَيتِ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَومِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ)) (١٧١).

---

(١٧٠) رواه البزار في كشف الأستار (٢/٣٣ رقم ١١٤٠)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (١٥٥٧).

(١٧١) رواه إبن حبان (١٨٨٦)، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (١١٥٥).

واتە: ... کاتێك حاجی سەری تاشی (پیاوان)، ئەوە هەر تاڵە قژێکی سەری کە بەردەبێتەوە سەر زەوی دەبێتە نورو ڕوناکی بۆی لە دواڕۆژدا، وە کاتێك حاجی (پیاوان و ئافرەتان) کۆتا سوڕانەوەی دەوری کەعبەی پیرۆزی تەواو کرد پاك دەبێتەوە لە تاوانەکانی بەوێنەی ئەو ڕۆژەی کە تازە لە دایك بووە (هیچ تاوانی نامێنێت).

وە هاوەڵی بەڕێز عبادة کوڕی صــامت (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... وَأَمَّا حَلْقُكَ رَأْسَكَ، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ شَعْرِكَ مِنْ شَعْرَةٍ تَقَعُ فِي الْأَرْضِ إِلَّا كَانَتْ لَكَ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) [١٧٢].

واتە: سەر تاشینت لە حەج ئەوەندە خێرە بە ڕادەیەك هیچ تاڵە موویەکی سەرت ناکەوێتە سەر زەوی ئیللا دەبێتە نورو ڕوناکی بۆت لە دواڕۆژدا.

## ١٢. فێربوونی زانستی شەرعی تەنها بۆ ڕازی بوونی خوای گەورە:

هاوەڵی بەڕێز أبوهريرة (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ رَجُلٍ يَسْلُكُ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا إِلاَّ سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقَ الْجَنَّةِ وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ)) [١٧٣].

واتە: هیچ پیاوێکی موسڵمان نییە کە ڕێگەیەك دەگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانست و زانیاری شەرعی، ئیللا خوای پەروەردگار بە هۆی ئەو کارەیەوە

---

[١٧٢] رواه الطبراني في "المعجم الأوسط" برقم (٢٤١٠)، وحسنه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (١١١٣).

[١٧٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٦٥)، وأبو داود (٣٦٤٣)، والدارمي (٣٤٤)، وابن حبان (٨١)، والحاكم (١/١٦٥)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٥٧١٥).

ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە هەر کەسێك کردەوەکانی دوای بخات ئەوە کەس و کارو عەشیرەت و ناوو داوی پێشی ناخات (کردەوەی چاکەی کەم بێت).

وە هەروەها أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ)) [١٧٤].

واتە: هەر موسڵمانێك ڕێگەیەك بگرێتە بەر، بەمەبەستی فێربوونی زانست و زانیاری شەرعی، ئەوە خوای پەروەردگار ڕێگەیەکی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

موسڵمانی خۆشەویست جوان ووردبەوە لە فەرموودەکە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) وازهێنانی لە فێربوونی زانست و زانیاری شەرعی پەیوەست کردووە بە دواکەوتن و هێواش ڕۆیشتن لەسەر پردی (صِراط)، ئەوەی ڕۆیشتنی بەندەی موسڵمان خێرا دەکات لەسەر پردی (صِراط) زانست و زانیاری شەرعی و کردەوەی چاکەیە نەك کەس و کارو عەشیرەت و ناوو داوی، وە هەرکەسێك خێرایی زیاد بێت لەسەر پردی (صِراط) بێگومان نورو ڕوناکییەکەی زۆرە.

زانای پایەبەرز إبنُ رَجَب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: سەرەڕای ئاسان بوونی پەڕینەوەی لەسەر پردی

---

[١٧٤] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٦٥)، ومسلم (٢٦٩٩)، والترمذي واللفظ له (٢٦٤٦)، وابن ماجه (٢٢٣)، والدارمي (٣٤٤).

(صِراط)، ناخۆشی و ناڕەحەتی پێش و دوای پردی (صِراط)یشی بۆ ئاسان دەبێت [١٧٥].

وە زانای پایەبەرز ئیمامی شافعي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: جارێکیان زانایەك نامەیەکی نووسی بۆ زانایەکی تر، تیایدا نووسیبوی: برای خۆم خوای پەروەردگار زانست و زانیاری شەرعی پێبەخشیوویت، تێکی مەدەو خراپی مەکە بە تاریکی تاوانەکان، لە دواڕۆژدا لە تاریکاییەکاندا دەمێنیتەوە، لە کاتێکدا زانایان و ئەهلی عیلم بە هۆی نورو ڕوناکی زانستیانەوە بەر پێیان ڕوناکەو پێی دەڕۆن [١٧٦].

**١٣. خۆش ویستن لەبەر خوای پەروەردگار:**

هاوەڵی بەڕێز أبومالك الأشعري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ اسْمَعُوا وَاعْقِلُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِبَادًا لَيْسُوا بِأَنْبِيَاءَ وَلَا شُهَدَاءَ، يَغْبِطُهُمْ الْأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ عَلَى مَجَالِسِهِمْ وَقُرْبِهِمْ مِنْ اللَّهِ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ الْأَعْرَابِ مِنْ قَاصِيَةِ النَّاسِ وَأَلْوَى بِيَدِهِ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ نَاسٌ مِنْ النَّاسِ لَيْسُوا بِأَنْبِيَاءَ وَلَا شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمْ الْأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ عَلَى مَجَالِسِهِمْ وَقُرْبِهِمْ مِنْ اللَّهِ؟ انْعَتْهُمْ لَنَا (يَعْنِي صِفْهُمْ لَنَا) فَسُرَّ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لِسُؤَالِ الْأَعْرَابِيِّ، فَقَالَ: رَسُولُ (ﷺ) هُمْ نَاسٌ مِنْ أَفْنَاءِ النَّاسِ وَنَوَازِعِ الْقَبَائِلِ لَمْ تَصِلْ بَيْنَهُمْ أَرْحَامٌ مُتَقَارِبَةٌ، تَحَابُّوا فِي اللَّهِ

---

[١٧٥] بڕوانە: جامع العلوم والحكم لابن رجب الحنبلي، تحقيق شعيب الأرناؤوط وإبراهيم باجس (٢/٢٩٧).

[١٧٦] بڕوانە: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم (٩/١٤٦).

وَتَصَافَوْا، يَضَعُ اللَّهُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ فَيُجْلِسُهُمْ عَلَيْهَا، فَيَجْعَلُ وُجُوهَهُمْ نُورًا وَثِيَابَهُمْ نُورًا، يَفْزَعُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلا يَفْزَعُونَ، وَهُمْ أَوْلِيَاءُ اللَّهِ الَّذِينَ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ)) [١٧٧].

واتە: ئەی خەڵکینە گوێ بگرن و تێبگەن، خوای پەروەردگار کۆمەڵە بەندەیەکی هەیە نە پێغەمبەرانن و (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) وە نە شەهیدانیشن، بەڵکو پێغەمبەران و (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) شەهیدان ئاوات بە پلەو پایەو شوێنی نزیکیان لە خوای پەروەردگار دەخوازن، پیاوێکی دەشتەکی لەوپەڕی قەومەکەوە هات و دەستی هەڵبڕی و ئیشارەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کردو ووتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کەسانێك لە خەڵکی هەن نە پێغەمبەرانن و (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) وە نە شەهیدانیشن، بەڵکو پێغەمبەران و (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) شەهیدان ئاوات بە پلەو پایەو شوێنی نزیکیان لە خوای پەروەردگار دەخوازن، کێن ئەو کەسانە بۆمان ڕوون بکەوەو باسی سیفاتەکانیانمان بۆ بکە؟ ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) گەشایەوە کاتێك ئەو پیاوە دەشتەکییە ئەو پرسیارەی لێکرد، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسانە چەند کۆمەڵێکن لە چەند هۆزێکی جیاواز، وە نازاندرێت لە چی خێڵ و کۆمەڵێکن، لەبەر خاتری خوای پەروەردگار یەکتریان خۆش دەوێت و ڕێکن لەگەڵ یەکتردا، بێ ئەوەی کەسی یەکتربن و خزمایەتی نزیك لە نێوانیاندا هەبێت،

---

[١٧٧] رواه الإمام أحمد واللفظ له"الفتح الرباني" (١٥٨/١٩)، وأبو داود عن عمر (ﷺ) (٣٥٢٧)، وابن حبان (٥٧٣)، وأبو يعلى، والحاكم (١٨٨/٤)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": صحيح لغيره (٣٠٢٧).

ئەو کەسانەی کە ئەوهان خوای پەروەردگار لە دواڕۆژدا مینبەریان لە نورو ڕوناکی بۆ دادەنێت و دایان دەنیشێنێت لەسەری، دەم و چاوو ڕوویـان گەش دەکات و جل و بەرگیشیان نورو ڕوناك دەکات، لەو ڕۆژەدا خەڵکی هەموویان دەترسێن و دڵیان ڕادەچەڵەکێت لە کاتێکدا ئەوان ترس و دڵە ڕاوکێیان لەسەر نییە، بەڕاستی ئەوانە دۆست و ئەولیای خوای گەورەن، ئەو کەسانەن کە نە ترسیان لەسەرەو نە خەفەتیش دەخۆن (واتە: نە ترسی سزاو ناڕەحەتی دواڕۆژیان هەیە، وە نە خەفەتیش دەخۆن لەوەی کە بە جێیان هێشتووە لە دونیادا).

## ١٤. جێبەجێکردنی کاری خەڵکی و لابردنی ناخۆشی و ناڕەحەتی لەسەریان:

هاوەڵی بەڕێز إبنُ عُمَر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) [١٧٨].

واتە: موسڵمان برای موسڵمانە زوڵم و ستەمی لێناکات و پشتی لێهەڵناکات و نایداتە دەست دوژمنانی، هەر موسڵمانێك کاروباری برای موسڵمانی جێبەجێ بکات و یارمەتی بدات، خوای پەروەردگار کارو باری ئەو موسڵمانە

---

[١٧٨] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٦٧)، والبخاري (٢٤٤٢)، ومسلم واللفظ له (٢٥٨٠)، والترمذي (١٤٢٦)، وأبو داود (٤٨٩٨).

هەڵدەسورێنێت و بەرێوەی دەبات، وە هەر موسڵمانێك ناخۆشی و ناڕەحەتییەك لەسەر موسڵمانێك لابدات خوای پەروەردگار ناڕەحەتییەك لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەكانی دواڕۆژی لەسەر لا دەبات، وە هەر موسڵمانێك عەیب و كەم و كوڕی موسڵمانێك بپۆشێت لە دونیادا خوای پەروەردگار كەم و كوڕی و عەیبەكانی ئەو موسڵمانە دەپۆشێت لە دواڕۆژدا.

وە هەروەها أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ نَفَّسَ عَنْ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ فِي الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ القِيامَة، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ فِي يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَة، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَة، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ ...)) [١٧٩].

واتە: هەر موسڵمانێك ناڕەحەتییەك لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەكانی دونیا لەسەر موسڵمانێك لابدات، ئەوە خوای پەروەردگار ناڕەحەتییەك لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەكانی دواڕۆژی لەسەر لا دەبات، وە هەر موسڵمانێك كار ئاسانی بۆ كەسێكی هەژارو نەبوو بكات، ئەوە خوای پەروەردگار كارەكانی لەسەر ئاسان دەكات لە دونیاو دواڕۆژدا، وە هەر موسڵمانێك عەیب و كەم و كوڕی موسڵمانێك بپۆشێت لە دونیادا، خوای پەروەردگار كەم و كوڕی و عەیبەكانی ئەو موسڵمانە دەپۆشێت لە دونیاو دواڕۆژدا، وە خوای پەروەردگار ئیش و كارەكانی بەندەی موسڵمان جێبەجێ دەكات، ئەگەر ئەو بەندە موسڵمانە لە خزمەتی برا موسڵمانەكەیدا بێت و كارەكانی بۆ جێبەجێ بكات...).

---

[١٧٩] الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٦٦)، ومسلم واللفظ له (٢٦٩٩)، والترمذي (١٤٢٥)، وأبو داود (٤٩٤٦)، وابن ماجه (٢٢٥).

موسـڵمانی خۆشەویـست پێغەمبـەر (ﷺ) جـۆری ئـەو ناڕەحەتییـەی بـاس نـەکردووە کـە لـە دوارۆژدا لەسـەرت لا دەبردرێـت، بـەڵکو بـە گـشتی باسـی کردووە، وە پاداشتیش لەسەر بنەڕەتی کردەوەکانـە، وە بـە هـۆی جێبـەجێ کردنـی کـاری موسـڵمانان و یارمـەتی دانیـان و لابردنـی ناخۆشـی و ناڕەحەتییان، خوای پەروەردگار ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دوارۆژت لەسەر لا دەبات، پێدەچێت یەکێك لەو ناخۆشـی و ناڕەحەتییانـە لابردنـی تـاریکی و ناڕەحەتی سـەر پـردی (صِراط) بێـت، نـورو ڕوناکیـت زیـاد دەبێـت بـە هـۆی لابردنی ناخۆشـی و ناڕەحـەتی برایانی موسـڵمانت، ئـەو کاتـە خێرایـی سـەر پردی (صِراط)ت زیاد دەبێت، وەك لـە فـەرموودەی صـەحیحدا هـاتووە هـەر موسڵمانێك لەگەڵ برایەکی موسـڵمانیدا بـڕوات بـۆ جێبـەجێ کردنـی کـارێکی پێویستی، تا ئەو موسڵمانە پێویستییەکەی تەواو دەکـات و تـەواو پێیـەکانی جـێگیر دەبێـت تیایـدا، ئـەوە خـوای پـەروەردگار پێیـەکانی جـێگیر دەکـات لەسەر پردی (صِــراط) لـەو ڕۆژەی کـە پێیـەکان هەڵدەخلیسکێن و خۆیـان ناگرن بەسەر پردی (صِراط)ەوە [١٨٠]، بە ئەندازەی ئاسان کردنی کاری بـرای موسڵمانت و یارمەتی دانـی خـوای پـەروەردگار ناخۆشـی و ناڕەحەتییـەکانی ئـەو ڕۆژە ترسـناکەت بـۆ ئاسـان دەکـات، دەی کـەوابوو هەوڵبـدە زۆر کـاری موسـڵمانان ئاسـان بکـەو یارمـەتییان بـدە، تـا خـوای پـەروەردگار هـەموو ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دوارۆژت لەسەر لا بدات و بۆت ئاسان بکات.

---

[١٨٠] رواه ابن أبي الدنيا، والطبراني، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع" (١٧٦).

## ١٥. هەڵنەكێشانی مووی سپــی:

هەنـدێ موسـڵمان شـەرم دەیگرێـت كاتێـك مـووی سـپی دەبێـت، وە حـەز ناكـات مـووی سـپی لێـدەر بكـەوێت، بۆیـە یەكسـەر هـەڵی دەكێـشێت، یـان سـبووغی دەكـات بـە ڕەنگـی ڕەش كـە ئـەویش حەرامـە، بـەڵام ئـەو كەسـە نازانێت كە موو سپی بوون لە ئیسلامدا دەبێتە نورو ڕوناكی لە دواڕۆژدا.

هاوەڵی بەڕێز فُضالَة كوڕی عُبَيد (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الإِسْلامِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ رِجَالا يَنْتِفُونَ الشَّيْبَ، فَقَالَ: مَنْ شَاءَ فَلْيَنْتِفْ نُورَهُ)) [(١٨١)].

واتە: هەر موسڵمانێك مووی لاشەی سپی بێت لە ئیسلامدا، ئەوە ئـەو مـوو سپیی بوونەی بۆ دەبێتە نورو ڕوناكی لـە دواڕۆژدا، پیاوێـك وتـی: كەسـانێك هەن مووی سپییان هەڵدەكێشن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جـا هـەر كەسـێك حەز دەكات نورو ڕوناكییەكەی نەهێڵێت و كەمی بكاتەوە با مووە سپییەكانی هەڵبكێشێت.

فەزڵی هێشتنەوەی مووی سپی و هەڵنەكێشانی ئەوەیـە خاوەنەكـەی چوار شتی پێدەدرێت لە دواڕۆژدا: ڕوناكی سەر پردی (صــــراط)، وە بـە هـەر تاڵـە موویەكی سـپی چاكەیەكی پێدەدرێت، وە تـاوانێكی لەسـەر لا دەچێت، وە بەهۆیەوە پلەیەك بەرز دەبێتەوە لە دواڕۆژدا.

---

(١٨١) رواه البزار، والطبراني، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٢٠٩٢).

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ تَنْتِفُوا الشَّيْبَ فَإِنَّهُ نُورٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَ مَنْ شابَ شَيْبَةً فِي الإِسْلاَمِ، كُتِبَ لَهُ بِهَا حَسَنَةٌ، وَحُطَّ عَنْهُ خَطِيئَةٌ، وَرُفِعَ لَهُ بِها دَرَجَةٌ)) (١٨٢).

واتە: مووی سپی لاشەتان هەڵمەکێشن، بەڕاستی نورو ڕوناکییە لە ڕۆژی قیامەتدا، وە هەرکەسێك مووی سپی بێت لە ئیسلامدا ئەوە بەهەر تاڵە موویەکی سپی چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت، وە تاوانێکی لەسەر لا دەچێت، وە بەهۆیەوە پلەیەك بەرز دەبێتەوە لە بەهەشتدا.

موسڵمانی خۆشەویست لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هەر فەرمانێکی پێغەمبەرو (ﷺ) کارێکی چاکە بە گاڵتە فەرمانمان پێنەکراوە کە بیکەین، بەڵکو قازانج و بەرووبومی باشی هەیە، وە تا خوای پەروەردگار پاداشتی چاکەی چاکەکاران بداتەوە، وە گوێڕایەڵی کارو تاوانبار لێك جیا بکاتەوە.

موو سپی بوون نیعمەتە، لەبەر ئەوەی ترسێنەرو بە یاد هێنەرەوەی کەسی ژیرە بە نزیکی مردن و ئەجەلی، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ (فاطر: ٣٧).

واتە: بێباوەڕان لە ئاگری دۆزەخدا زۆر هاوار دەکەن و دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ پەروەردگارمان لەم سزاو

---

(١٨٢) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧/٣١٥)، والترمذي (٢٨٢١)، وابن ماجه (٣٧٢١)، وابن حبان، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": حسن صحيح (٢٠٩٦).

ناڕەحەتییە دەرمان بێنە، تا ئەم جارە کاری چاکە ئەنجام بدەین جگە لەو کارە خراپانەی پێشوو کە دەمان کرد، ئەو کاتە باوەڕ دێنین و تەنها گوێڕایەڵی تەواوی تۆ دەکەین، وەڵامیان دەدرێتەوەو پێیان دەووترێت: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾ ئایا ئەوەندە تەمەنی درێژمان پێنەدان کە هەر کەسێك ژیرو وریا بوایە لەو ماوەیەدا بیر بکاتەوە، کە دەیتوانی پەندو کەڵکی لێ وەربگرێت؟ لە هەمان کاتیشدا ترسێنەرمان بۆ ناردن تا بتان ترسێنێت لەم سزا گەورەو ناڕەحەتە، بەڵام ئایا هیچ سوودتان لێبینی؟ ﴿فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ دەی کەوابوو سزای زوڵم ستەمتان بچێژن، لەو ڕۆژەدا هیچ یارمەتی دەرێك نییە بۆ زاڵمان و ستەمکاران.

جارێکیان عَبدالعزیزِ کوڕی أبورَوّاد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بە پیاوێکی ووت: هەر کەسێك پەند لە سێ شت وەرنەگرێت ئەوە هەرگیز پەند لە هیچ شتێك وەرناگرێت: ئیسلام، قورئانی پیرۆز، موو سپی بوون (پیر بوون) [١٨٣].

## ١٦. چاکە کردن لەگەڵ دۆستانی باوکت:

هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی ئیمامی عُمَر (خوایان لێ ڕازی بێت) جارێکیان لە سەفەرێکدا پیاوێکی دەشتەکی بینی کە دۆستی باوکی بوو، پیاوە دەشتەکییەکە بە عَبدُالله ووت: تۆ کوڕی فلانە کەس نیت؟ (واتە: ئیمامی عُمَر (خوای لێ ڕازی بێت)؟ عبدالله فەرمووی: بەڵێ، پاشان عَبدُالله (خوای لێ ڕازی بێت) ئەو گوێ درێژەی کە پێی بوو دایپێ لەگەڵ عەمامەکەی سەری،

---

[١٨٣] بڕوانە: صفة الصفوة لابن الجوزي (١/٤٧٠).

ئەوانەی لەگەڵ عَبدُالله بوون، ووتیان: ئایا بەس نەبوو تەنها دوو درهەمت بدایەتێ؟ عبدالله(خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إحْفَظ وِدَّ أبيْك لا تَقْطَعْه فيُطفىءُ اللهُ نُورَكَ)) [١٨٤].

واتە: دۆستایەتی و خۆشەویستی باوکت بپارێزەو مەیبڕە، ئەگەر وا بکەیت ئەوە خوای پەروەردگار نورو ڕوناکیت دەکوژێنێتەوە.

زانای پایەبەرز ئیمامی الـمُناوي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی حافظِ العرافي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئایا مەبەست بە نەمان و کوژانەوەی نورو ڕوناکی لە دونیا دایە یان لە دوارۆژدایە؟ پێدەچێت لە هەردوو لا بێت [١٨٥].

## ١٧.داوا کردنی نورو ڕوناکی لە خوای پەروەردگار:

موسڵمانی خۆشەویست زۆر داوا بکە لە خوای پەروەردگار تا نورو ڕوناکیت پێببەخشێت، لە سوجەدەدا، ئەو کاتەی ئەڕۆیت بۆ مزگەوت.

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی عَبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: شەوێکیان لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) خەوتم، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا بۆ شەو نوێژ کردن سیواکی کردو دەستنوێژی شوشت و ئەم ئایەتانەی دەخوێند: ﴿

---

[١٨٤] قال الهيثمي في مجمع الزوائد: رواه الطبراني في الأوسط وإسناده حسن اهـ (١٤٧/٨)، ووافقه السيوطي في الجامع الصغير (٢٦٥) والمناوي في فيض القدير وقال: قال زين الحفاظ العراقي إسناده جيد اهـ (١٩٦/١)، **بەڵام زانای پایەبەرز شێخ ئەلبانی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەم فەرموودەیەی بە "ضَعيف" داناوە، بڕوانە: الأدب المفرد (٤٠).**

[١٨٥] **بڕوانە:** فيض القدير شرح الجامع الصغير للمناوي (١٩٦/١).

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِي سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾﴾ (آل عمران: ١٩٠-٢٠٠).

**پاشان هەستا دوو ڕکات نوێژی کرد، تیایدا زۆر بە پێوە وەستاو ڕکوع و سوجدەی زۆر درێژ کردەوە، پاشان چووەوە سەر جێگاکەی خەوت تا پرخە پرخی لێوە هات، (پێغەمبەر (ﷺ) بە چاو دەخەوت بەڵام دڵی بە ئاگابوو)،**

سێ جار ئەم کارەی دووبارە کردەوە لە نێوان شەش ڕکاتدا، لە نێوان هەردوو ڕکاتێکدا سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەشوشت و ئەم ئایەتانەی دەخوێند، پاشان سێ ڕکات نوێژی ویتری کرد، پاشان بیلال (خوای لێ ڕازی بێت) هات بانگیدا، دوای بانگ پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ نوێژو لە ڕێگا دەیفەرموو: ((اللهُمَ اجعَل فِي قَلبِي نُوراً، وَ فِي لِسانِي نُوراً، وَ اجعَل فِي سَمعِي نُوراً، وَ اجعَل فِي بَصَرِي نُوراً، وَ اجعَل مِنْ خَلفِي نُوراً، وَ مِنْ وأمامِي نُوراً، وَ اجْعَلْ مِنْ فَوقِي نُوراً، وَ مِنْ تَحتِي نُوراً، اللهم أعْطِنِي نُوراً)) [186].

واتە: ئەی خوایە نورو ڕوناکی بکەیتە ناو دڵمەوە، وە ڕوناکی بکەیتە زمانمەوە، وە ڕوناکی بکەیتە گوێیەکانمەوە، وە ڕوناکی بکەیتە چاوەکانمەوە، وە پشتمەوە نورو ڕوناک بکەیت، وە پێشمەوە ڕوناک بکەیت، وە سەرووم ڕوناک بکەیت، وە ژێرم ڕوناک بکەیت، وە خوایە نورو ڕوناکیم پێببەخشیت.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی النَّسائي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوعایەی لە سوجدەدا خوێندووە.

زانای پایەبەرز إبنُ عَلان (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی قُرطُبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەو نورو ڕوناکییانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای کردووە دەتوانرێت لەسەر ڕواڵەتی فەرموودەکە لێك بدرێتەوە، واتە: داواکردنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبووە کە خوای پەروەردگار نورو ڕوناکی بکاتە

---

[186] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٣/٢٩١)، والبخاري (٦٣١٦)، ومسلم واللفظ له (٧٦٣)، وأبو داود (١٣٥٣)، والنسائي (١١٢١).

هەموو ئەندامەکانی لاشەیەوە تا بتوانێت بە هۆیەوە تاریکییەکانی دوارۆژی پێ ڕوناك بکاتەوە، بەڵام لە پێشتر وایە بگووترێت داواکردنی ئەو نورو ڕوناکییە عیلم و ڕێنمونی و هیدایەتە [١٨٧].

موسڵمانی ژیر نابێت واز بێنێت لە داواکردنی نورو ڕوناکی لە خوای پەروەردگار، بەڵکو دەبێت بەردەوام بێت لە داواکردنی، هەر لەبەر گرنگی نورو ڕوناکییە کە موسڵمانان لە دوارۆژیشدا داوا لە خوا دەکەن تا بۆیان زیاد بکات، ئایا فەرموودەی خوای پەروەردگارت نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمووێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾ (التحريم: ٨).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوەو ئیماندارن، تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگارو تەوبەیەکی یەکجاری بکەن، تەوبەیەکی (نَصوح) بکەن، پرسیار کرا لە ئیمامی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) تەوبەی (نَصوح) چییە؟ ئەویش (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: تەوبەی (نَصوح) ئەوەیە: ئەو کەسە تاوانبارە لە تاوانەکانی پەشیمان بێتەوەو جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەری، چۆن شیر هەر کە هاتەدەر لە گوانی ئاژەڵ جارێکی تر ناگەڕێتەوە ناو گوانی، ئەو کەسەش نابێت جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر تاوانەکانی پێشووی، بێگومان بن ئەگەر تەوبەیەکی ئاوهاتان کرد خوای

---

[١٨٧] بڕوانە: الفتوحات الربانية على الأذكار النووية، لابن علان الصديقي (٢/٣٧).

پەروەردگار لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە بەهەشتانێکەوە کە ڕووبارو ئاوی ساف و سازگار بە ژێر باخەکانیدا دەڕوات، ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ﴾ لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) خوای پەروەردگار پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوانەی کە بە ڕاستی باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیا زەلیل و سەرشۆڕ ناکات، ﴿نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا﴾ نوورو ڕوناکیان لەبەر دەمیانەوەو لە لای ڕاستیانەوە دەدرەوشێتەوەو لەسەر پردی (صِراط) پێی دەڕۆن و دەڵێن: ئەی پەروەردگاردمان نورو ڕوناکییەکەمان بۆ تەواوو بەردەوام بکەو لێمان خۆش بە، ﴿إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایت.

زانای پایەبەرزو ڕاڤەکاری قورئانی پیرۆز إبنُ کَثیر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی مجاهد و ضَحاك وحَسن البصري و جگە لەوانیش (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) فەرموویانە: لە دواڕۆژدا کاتێك ئیمانداران دەبینن نورو ڕوناکی دووڕووەکان دەکوژێتەوە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا﴾ [(١٨٨)].

موسڵمانی خۆشەویست هەموو ئەو کارە چاکانەی باسمان کرد نورو ڕوناکی ئیمانداران زیاد دەکات لە دواڕۆژدا (لە ڕۆژی تاریکایی و ناخۆشی و ناڕەحەتی)، داواکارین لە خوای پەروەردگار کە نورو ڕوناکی زۆرمان پێببەخشێت لە دواڕۆژدا تا بەرچاومان ڕۆشن و ڕوناك بێت و بە ئاسانی لە

---

[(١٨٨)] بڕوانە: تفسير القرآن العظيم لإبن كثير (٦/٢٢٢).

تاریکایی ساحەی مەحشەرو سەر پردی (صِراط) بپەڕینەوەو ڕزگارمـان بێـت، آمیــــــــن.

## بەشی چوارەم:
## ئەو تاوانانەی کە بە هۆیەوە خاوەنەکەی دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە

موسڵمانی خۆشەویست پێویستە ئەوە بزانرێت کە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندەیان دەچنە دۆزەخەوە کەس ژمارەیان نازانێت مەگەر تەنها خوای پەروەردگار، ئەویش لەبەر ئەوەی تاوان و سەرپێچی خوای پەروەردگاریان زۆر کردووە.

هاوەڵی بەڕێز عبدالله کوڕی عَمْرو (خوایان لیّ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يَدْخُلُ مِنْ أَهْلِ هَذِهِ الْقِبْلَةِ النَّارَ مَنْ لا يُحْصِي عَدَدَهُمْ إِلاّ اللهُ، بِمَا عَصُوا اللَّهَ، وَاجْتَرَأُوا عَلَى مَعْصِيَتِهِ، وَخَالَفُوا طَاعَتَهُ، ...)) [١٨٩].

واتە: ئەوەندە کەسانی ئەهلی قیبلە (موسڵمانان) دەچنە دۆزەخەوە کە کەس ژمارەیان نازانێت مەگەر تەنها خوای پەروەردگار، ئەویش لەبەر ئەوەی تاوان و سەرپێچی خوای پەروەردگاریان زۆر کردووە، وە بە بوێرانەو بێ ترس و بێ شەرم سەرپێچی خوای گەورەیان کردووە، وە بە پێچەوانەی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار جولاونەتەوە، بەڵام مەرج نییە ئەوەی کەوتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە هەمیشەیی تیایدا بمێنێتەوە.

---

[١٨٩] رواه الطبراني، وحسن إسناده الحافظ إبن حجر في الفتح (١١/٤٦٣) (ح ٦٥٧٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣٦٤٠).

موسڵمانی وا هەیە بە هۆی هەندێ تاوانەوە کە کردوویەتی لەسەر پردی (صِراط)ـەوە بەر دەبێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ، هەرچەندە ئەو موسڵمانە سوور بووە لەسەر کردنی ئەو کارە چاکانەی کە هۆکار بوونە بۆ خێراکردنی ڕۆیشتنی لەسەر پردی (صِراط)، وەکو نوێژو ڕۆژوو و چەندین کاری تری گەورەی چاکە، لە فەرموودەی پیرۆزی صەحیحدا هاتووە کە هەندێ لە موسڵمانان بەردەوام پارێزگاریان کردووە لە نوێژو زەکات و حەج و جیهاد، بەڵام سوودی پێنەگەیاندوون بۆ پەڕینەوەیان لەسەر پردی (صِــراط)، بۆیە بەردەبنەوە ناو ئاگری دۆزەخ، پێدەچێت هۆکارەکە ئەوە بێت ئەو کردەوە چاکانەیان لێ وەرنەگیرابێت، یان چەند تاوانێکی گەورەیان هەبووبێت و تەوبەیان لێنەکردبێت و خوای پەروەردگار لێیان خۆش نەبووبێت.

هاوەڵی بەڕێز أبوسَعید الخُدري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: کەسانێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، ئایا ئێمە خوای پەروەردگار دەبینین لە دواڕۆژدا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا ئێوە تووشی هیچ نارەحەتی و زەحمەتێك دەبن لە کاتی سەیر کردنی خۆرو مانگ لە ڕۆژێکی ساف و بێ تەم و هەوردا؟ ووتیان: نەخێر، (واتە: بێگومان خوای پەروەردگار دەبینن)، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((... ثُمَّ يُضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، وَيَقُولُونَ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَمَا الْجِسْرُ؟ قَالَ: دَحْضٌ مَزِلَّةٌ. فِيهِ خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكٌ تَكُونُ بِنَجْدٍ فِيهَا شُوَيْكَةٌ يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ، فَيَمُرُّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ الْعَيْنِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَالطَّيْرِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَمَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ. حَتَّى إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي

بِيَدِهِ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ بِأَشَدَّ مُنَاشَدَةً لِلَّهِ فِي اسْتِقْصَاءِ الْحَقِّ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِلَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ فِي النَّارِ، يَقُولُونَ: رَبَّنَا كَانُوا يَصُومُونَ مَعَنَا وَيُصَلُّونَ وَيَحُجُّونَ. فَيُقَالُ لَهُمْ: أَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ. فَتُحَرَّمُ صُوَرُهُمْ عَلَى النَّارِ، فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا قَدْ أَخَذَتِ النَّارُ إِلَى نِصْفِ سَاقَيْهِ وَإِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنَا مَا بَقِيَ فِيهَا أَحَدٌ مِمَّنْ أَمَرْتَنَا بِهِ. فَيَقُولُ: ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا أَحَدًا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا. ثُمَّ يَقُولُ: ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْفِ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا أَحَدًا. ثُمَّ يَقُولُ: ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ: رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا خَيْرًا ...)) [١٩١].

واته: پاشان پردی (صِـــراط) دادەنرێت لەسـەر پـشتی دۆزەخ، ڕێگـە بـە شەفاعەت کردن دەدرێت، پێغەمبەران (صەلاوات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) دەڵـێن: خوایـە سـەلامەتیان بکـە، خوایـە سـەلامەتیان بکـە، ووتـرا: ئـەی پێغەمبەر (ﷺ) ئـەو پـردە چییەو چۆنە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: پـردی (صِـــراط) ڕێگەیەکـە زۆر لووسـە پێـی لەسـەر بەنـد نابێـت بـەڵکو هەڵدەخلیسکێت، لەسەر ئەو ڕێگەیە کۆمەڵە قـولاپ و ڕاکێشەرێك هەیـە، وە دڕکێکـی پێوەیـە کـە بەلەشـیانەوە دەنوسـێت و ڕایـان دەکێـشێت، پێـی

[١٩١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٠٨/٢٤)، والبخاري (٧٤٣٩)، ومسلم واللفظ له (١٨٣)، والنسائي (٥٠٢٥)، والحاكم (٥٨٢/٤).

دەووترێت: دڕکی (سَعدان) کە لە وڵاتی نەجد هەیە، پاشان موسڵمانان کۆمەڵ کۆمەڵ بە پێی کردەوەکانیان بەسەریدا دەڕۆن، یەکەم کۆمەڵیان بە وێنەی چاو تروکان، پاشان بەوێنەی تیشك و هەورە بروسکە، پاشان وەکو خێرایی با بەسەریا دەڕۆن، پاشان وەکو ڕۆیشتنی باڵندە، پاشان وەکو سوارچاکێکی باش، پاشان وەکو ڕۆیشتنی پیاوێکی خێرا، وە هەیانە بە پیادە دەپەڕێتەوەو بەسەلامەتی ڕزگاری دەبێت، وە هەیانە ڕزگاری دەبێت بەڵام لەش و دەم و چاوی ڕووشاوە، هەیانە بەردەبێتەوە ناو ئاگری دۆزەخ و ناتوانێت بپەڕێتەوە، هەتا موسڵمانان ڕزگاریان دەبێت لە ئاگری دۆزەخ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو پەروەردگارەی کە گیانی منی بەدەستە هیچ کەس لە ئێوە نییە لە دونیادا کە داوا لە خوا بکات بۆ بە دەست هێنانی مافی خۆی لەو کەسەی کە زوڵم و ستەمی لێکردووە، وەکو داواکردنی ئیمانداران لە خوای پەروەردگار تا ڕێگەیان بدات بۆ شەفاعەت کردن بۆ برایانی موسڵمانانی تاوانبارو سزادراویان لە دواڕۆژدا (واتە: ئەوەندە خەمی برایانی موسڵمانانی ناو دۆزەخیان زیاتر لە حەق و مافەکانی خۆیان لە دونیادا)، ئیمانداران دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئەو موسڵمانانە ڕۆژوویان دەگرت لەگەڵماندا، وە نوێژیان دەکرد، وە حەجیان دەکرد، پێیان دەووترێت: بڕۆن ئەو کەسانەی دەیان ناسن دەریان بێنن لە ناو دۆزەخدا، ئاگری دۆزەخ شێوەو ڕوخساری تێك نەداون، ئەوانیش دەچن کۆمەڵێکی زۆر دەردێنن کە ئاگری دۆزەخ تا نیوەی ئەژنۆ، یان سەر ئەژنۆیانی گرتووەو سووتاندوویەتی، کاتێك دەگەڕێنەوە دەڵێن: ئەی پەروەردگار هیچ کەس نەماوە لەو کەسانەی کە فەرمانت پێکردین تا دەریان بێنین، خوای

پـەروەردگار پێیـان دەفـەرموێت: بگەڕێنـەوە سـەیر بکـەن هەرکەسێك لـە موسـڵمانانی نـاو ئـاگری دۆزەختـان بینـی بـە ئەنـدازەی قورسـی دەنکـە گەردیلەیـەك خێـرو چاکەی هـەبوو دەری بێـنن لـە دۆزەخ، ئـەوانیش دەچـن کەسـانێکی زۆر دەردەکـەن لـە دۆزەخ، کاتێـك دەگەڕێنـەوە دەڵـێن: ئـەی پەروەردگار هیچ کەسێکمان نەهێشت لەو کەسانەی کە فەرمانت پێکردین تـا دەریان بێنین لە دۆزەخ، لە دواییدا دەڵێن: ئەی پەروەردگار کەسێك نـەماوە کە خێرو چاکەی هەبێت تا ئێمە دەری بێنین، ...) [192].

موسڵمانی خۆشەویست جوان وردبەوە لـە ووتـەی ئیمانداران کـە باسـی برایانی موسـڵمانیان دەکـەن و دەڵـێن: (رَبَّنَا كَانُوا يَصُومُونَ مَعَنَـا وَيُـصَلُّونَ وَيَحُجُّونَ) ئەی پەروەردگار ئەو موسڵمانانە ڕۆژوویان دەگرت لەگەڵمانـدا، وە نوێژیان دەکرد، وە حەجیان دەکرد، (موسڵمان بوونەو کردەوەی چاکەشـیان زۆر بووە، بـەڵام ئێـستا چوونەتە ئـاگری دۆزەخـەوە) بەڕاسـتی کارەسـات و موصیبەتێکی زۆر گەورەیە کە موسڵمان ڕوکنەکانی ئیسلام بە جێ بگەیەنێت و کردەوە چاکەکانیش بکات پاشان بـچێتە ئـاگری دۆزەخـەوە، (خـوا هـەموو لایەکمان بپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ)، دەی کەوابوو بابزانین ئەو تاوانانە چـین کە بە هۆیەوە موسڵمانانی تاوانبار دەچنە دۆزەخەوە؟

---

[192] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/٢٠٨)، والبخاري (٧٤٣٩)، ومسلم واللفظ له (١٨٣)، والنسائي (٥٠٢٥)، والحاكم (٤/٥٨٢).

## ئەو تاوانانە چین کە بە هۆیەوە خاوەنەکەی دەچێتە دۆزەخەوە؟

موسڵمانی خۆشەویست ناتوانرێت ئەو تاوانانە هەموویان بژمێردرێت و دیاری بکرێت، لەبەر زۆریان، وە نەبوونی بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ئەوەی کە هەر موسڵمانێك بیان کات دەچێتە دۆزەخەوە، هەرچەندە هەڕەشەی دۆزەخ کراوە لەو کەسەی کە دەیان کات، **گەورەترین تاوانەکان ئەم تاوانەن:**

**یەکەم: کەوتنە ناو ئارەزووە حەرامەکانەوە:**

ئارەزووە حەرامەکان: ئارەزووە دیارو هەست پێکراوەکان و ئارەزووە شاراوەکانیش دەگرێتەوە، ئارەزووە دیارو هەست پێکراوەکان وەکو: شەهوەت و ئارەزووی سك و داوێن، ئارەزووە شاراوەکانیش وەکو: حەز کردن بە پلەو پایەو خۆ دەرخستن و تۆڵە سەندنەوە.

هاوەڵی بەڕێز أبو بَــرزة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ مِمَّا أَخَافُ عَلَيْكُمْ شَهَوَاتِ الْغَيِّ فِي بُطُونِكُمْ وَفُرُوجِكُمْ، وَمُضِلاتِ الْهَوَى)) [١٩٣].

واتە: ترسناکترین شتێك کە لێی بترسم تووشتان بێت: ڕۆچوون و شوێنکەوتنی حەزو ئارەزووەکانی سك و داوێنتانە (ئەو تاوانانەی کە بە دڵ و دەروون دەکرێت، وە ئەو تاوانانەی بە داوێن دەکرێت)، وە شوێنکەوتنی ئارەزووە سەرلێشێوێنەرەکانە.

---

[١٩٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٨٠)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب (٥٢).

کەوتنە ناو ئارەزووە حەرامەکانی وەکو: زیناو نێربازی و خواردنەوەی مەیی و تێڕوانین بۆ ئافرەتانی بێگانەو (نەزەر کردن)، پەیاکردنی ماڵی حەرام و گاڵتە کردن بە ناموسی خەڵکی و .... هتد، کە مرۆڤ لەززەت و ئارەزووی پێوە وەردەگرێت، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار حەرامی کردووە، هەموو ئەم کارە حەرامانە هۆکارە بۆ ئەوەی خاوەنەکەی بچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

زانای پایەبەرز إبنُ حَجَر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی القاضي أبوبَكر العربي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتوویەتی: ئەو قولاپانەی کە بەدەوری پردی (صِراط)وە هەیە ئەو هەواو ئارەزووانەن کە لە فەرموودەکەی پێشوودا ئاماژەی بۆ کراوە، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((حُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ)) واتە: ئاگری دۆزەخ دەورە دراوە بە هەواو ئارەزووەکان، هەواو ئارەزووەکان دانراون بە دەوری دۆزەخەوە، هەرکەسێك شوێنی ئارەزوویەك بکەوێت دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە، لەبەر ئەوەی تاوانەکان ڕاکێشەرن بۆ ناو دۆزەخ [١٩٤].

دەی خۆزگە خەڵکی بەخەر بهاتنایە لەو خەوە بێئاگاییەی کە تیایدان، وە بە ئاگا بهاتنایە لەو پێهەڵخلیسکان و کەوتنە ناو هەواو ئارەزووە حەرامەکانەوە لە کاتی سەفەرەو گەشت و تێڕوانین بۆ هۆکارەکانی ڕاگەیاندن (تەلەفزیۆن و سەتەلایت و ئەنتەرنێت و مۆبایل و کتێت و گۆڤارە بەدڕەوشتییەکان)، بێئاگان لەو هەموو سزاو ناخۆشی و ناڕەحەتی و ئەو

---

[١٩٤] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري لإبن حجر العسقلاني (٤٦١/١١ ح ٦٥٧٤).

قولاپانەی تەنیشت پردی (صِراط) کە چاوەڕییان دەکات و بەزەیی بە هیچ کەسێکدا نایات، فەرمان کرابێت هەرکەسێك ڕابکێشرێت بۆ ناو دۆزەخ، ڕادەکێشرێت و لە بیر ناکرێت، پیاوان و ئافرەتانی پیێ هەڵخلیسکاو لەسەر پردی (صِراط)و بەرەوە بوو بۆ ناو دۆزەخ زۆر زۆرن لەو ڕۆژەدا.

زانای پایەبەرز إبنُ رَجَب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: لە کاتێکدا ئیمان و کردەوەی چاکە لە دونیادا ئەو ڕێگە ڕاستەیە کە خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە تا بەندەکان لەسەری بڕۆن و بەردەوام بن لەسەری، وە فەرمانی پێکردوون کە داوا لە خوا بکەن تا خوا هیدایەتیان بدات بۆی، بۆیە هەر موسڵمانێك لە دونیادا ڕێگەی تەنها ئەو ڕێگە ڕاستە بێت لە ڕواڵەت و دەروونیدا، ئەوە پێیەکانی جێگیر دەبێت و ڕێك و ڕاست لەسەر ئەو پردی (صِراط)ەی کە لەسەر دۆزەخ دانراوە دەڕوات و بە سەلامەتی دەپەڕێتەوە، بەڵام هەرکەسێك لە دونیادا تەنها لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستە نەبێت لە ڕواڵەت و دەروونیدا، بەڵکو لابدات بەلای فیتنەو ئاشووبی گومانەکان یان هەواو ئارەزووەکان، ئەوە قولاپە ڕاکێشەرەکانی سەر پردی (صِـــراط) ڕایان دەکێشێت، بە پێی لادانیان لە ڕێگە ڕاستەکەی خوای پەروەردگارو شوێنکەوتنی گومانەکان یان هەواو ئارەزووەکان، هەروەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَـــالِهِمْ)) واتە: قولاپەکانی تەنیشت پردی (صِـــراط) تاوانباران بە پێی تاوانەکانیان ڕادەکێشێت [١٩٥].

---

[١٩٥] بڕوانە: التحويف من النار والتعريف بحال دار البوار للحافظ إبن رجب الحنبلي، تحقيق إياد القيسي

ئیمامی سَهْلِ کوڕی عَبدُالله التَستُري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: هەر کەسێك لە دونیادا ڕێگە لەسەر خۆی تەسك بکات، ئەوە لە دواڕۆژدا بۆی پان و فراوان دەبێت (واتە: پردی صِراط)، وە بە پێچەوانەوە هەر کەسێك لە دونیادا ڕێگە لەسەر خۆی پان و فراوان بکات، ئەوە لە دواڕۆژدا بۆی تەسك وتەنگ دەبێت (واتە: پردی (صِراط)ی لەسەر تەسك دەبێت) [196].

زانای پایەبەرز إبنُ رَجَب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەسەر ووتەکەی ئیمامی سَهلِ کوڕی عَبدُالله التستري دەفەرموێت: مانای ووتەکەی ئەوەیە: هەر کەسێك ژیان لەسەر خۆی تەسك بکاتەوە لە دونیادا بە شوێن کەوتنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگارو پێغەمبەرو (ﷺ) دورکەوتنەوە لە تاوانەکان، کە ئەوەش ڕاستێتی بەردەوام بوونە لەسەر ڕێگای ڕاست لە دونیادا، ئەوە پاداشتی لە دواڕۆژدا ئەوەیە: پردی (صِراط)ی بۆ فراوان دەکرێت، وە هەر کەسێك ژیان لەسەر خۆی فراوان بکات لە دونیادا بە شوێن کەوتنی ئارەزووە حەرامەکان و ئارەزووە سەرلێشێوێنەرەکان تا لە ڕێگەی ڕاست دەردەچێت، ئەوە سزاکەی لە دواڕۆژدا ئەوەیە: پردی (صِراط)ی لێ تەنگ و تەسك دەکرێتەوە بە پێی دوورکەوتنەوەی لە ڕێگا ڕاستەکەوەو شوێن کەوتنی ئارەزووە حەرامەکان [197].

---

(صفحة ٢٣٠).

[196] بڕوانە: حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم (١٠/١٩٧)، وصفة الصفوة لإبن الجوري (٢/٢٧٨).

[197] بڕوانە: التخويف من النار والتعريف بحال دار البوار للحافظ إبن رجب الحنبلي، تحقيق إياد القيسي (صفحة ٢٣٣).

زانای پایەبەرز إبنُ تیمیة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: لـە کاتێکدا دۆزەخ بەربەسـت کـراوەو دەورە دراوە بـە ئارەزووەکـان هـیچ کـەس ناچـێتە نـاوی مەگەر بە هۆیانەوە نەبێت (بە هۆی حەرامەکانەوە)، وە لە کاتێکدا بەهەشـت بەربەست کراوەو دەورە دراوە بە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکان ئەوە هیچ کەس ناچێتە ناوی مەگەر بە هۆیانەوە نەبێت (بە هۆی کارە چاکەکانەوە) [١٩٨].

بۆیە پێویستە موسڵمان بەردەوام بێت لەسەر دینی خوای پەروەردگار، وە خۆی بپارێزێت لە هەندێ شتی حەڵاڵی دونیایی تـا نەکەوێتـە نـاو حەرامـەوە، هەروەك هاوەڵی بەڕێز أبوذر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفـەرمووێت: خۆشەویـستم (واتە: پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێدام کە پـردی (صِراط) ڕێگەیـەکی خلیـسکەو پێی لەسەر بەند نابێت، وە ئێمە کاتێك دەچینە سەری ئەگەر بارمـان سـووك بێت (تاوانمان کەم بێت و لێپرسینەوەمان سووك بێت)، ئەوە زووتر ڕزگارمان دەبێـت لێـی وەك لـەوەی کـە بارمـان قـورس بێـت کاتێـك دەچـینە سـەری (تاوانمان زور بێت و لێپرسینەوەمان قورس بێت) [١٩٩].

**دووەم: تەوبە نەکردن لە تاوانە گەورەکان:**

بەڵگەکانی قورئانی پیرۆزو فـەرموودە صـەحیحەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەوە دەسەلمێنن ئەو موسڵمانە خوا بە تەنها پەرستانەی کـە دەچـنە دۆزەخـەوە، بـە هـۆی ئـەو تاوانانەوەیـە کـە کردوویانـەو لەسـەری مردوونـە بـێ ئـەوەی تەوبەیەکی ڕاستەقینەیان لێ کردبێـت، وەکـو خـواردنی ڕیبـا، بەکـەم زانینـی

---

[١٩٨] بڕوانە: الاستقامة لإبن تيمية (١/٤٥١).

[١٩٩] رواه الإمام أحمد "المسند" (٢١٤٥٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٣١٧٨).

خەڵکی و مافەکانیان، بیدعە کردن، شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپەڕەقەی پێیەکان (بۆ پیاوان)، خۆ بە زل زانین، ووتنی ووتەیەك کە خوای پەروەردگار پێی ناخۆشە، درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، وە جگە لەم تاوانە گەورانە کە هەڕەشە لە خاوەنەکانیان کراوە بە ئاگری دۆزەخ، یان نەفرەت لێکردن، یان توڕەیی خوای پەروەردگار، یان بوونی وەیل بۆیان، یان بوونی سزای توند بۆیان، یان بوونی حەد لەسەریان، پەنا دەگرین بە خوای پەروەردگار [٢٠٠].

موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی کە زانراوە ئەوەیە: پێنج نوێژە فەرزەکە تەنها گوناهە بچوکەکان دەسڕنەوە نەك گوناهە گەورەکان، **لەسەر بۆچوونی هەندێك لە زانایان،** چونکە تاوانە گەورەکان مەگەر تەوبەیەکی نەصوح و ڕاستەقینە بیان سڕێتەوە.

**هاوەڵی بەڕێز** أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((الصَّلَواتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ)) [٢٠١].

واتە: کردنی پێنج نوێژە فەرزەکە، وە کردنی نوێژی هەینی تا هەینی داهاتوو، وە گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، دەبنە کەفارەتی تاوانەکان ئەگەر ئەو بەندە موسڵمانە خۆی لە تاوانە گەورەکان پاراستبێت.

---

[٢٠٠] تاوانە گەورەکان زۆر لەوە زیاترن کە خەڵکی دەیان کات و زۆر بە سووکی سەیریان دەکات، بۆ زیاتر شارەزابوون لە تاوانە گەورەکان، بڕوانە ئەم کیتابانە: "الكبائر" و "تبيين المحارم" للإمام الذهبي، و "الزواجر عن اقتراف الكبائر" للإمام الهيتمي" وە جگە لەم کیتابانە.

[٢٠١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩٨/٢)، ومسلم واللفظ له (٢٣٣) والترمذي (٢١٤).

**بەڵام هەندێ لە زانایان بۆچوونیان وایە کە کردنی پێنج نوێژە فەرزەکە دەبێتە هۆکاری سڕینەوەی هەموو تاوانەکان هەتا تاوانە گەورەکانیش،** بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەیە کە هاوەڵی بەڕێز أبــو هريــرة (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((أَرَأَيْتُم لَو أَنَّ نَهْــراً بِبَاب أحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّات، هَل يبْقى من دَرَنِه شَيْءٌ؟ قَالُوا: لا يبْقى من دَرَنِه شَيْءٌ. قَالَ: فَكَذَلِك مثل الصَّلَوَات الْخَمس يَمْحــو الله بِهِــنَّ الْخَطَايَا)) [٢٠٢].

واتە: ئەگەر ڕووبارێك بەبەردەمی ماڵی یەکێکتاندا بڕوات و ڕۆژی پێنج جار خۆی تیا بشوات، ئایا ئەو کەسە هیچ چڵك و پیسی بەلاشەیەوە دەمێنێت؟ هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویان: نەخێر هیچ چڵك و پیسی بەلاشەیەوە نامێنێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەی ئەوە وێنەی پێنج نوێژە فەرزەکەیە خوای پەروەردگار تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە (چۆن ئەو ئاوە لاشە پاك دەکاتەوە لە چڵك و پیسی، بەهەمان شێوە کردنی نوێژە فەرزەکانیش موسڵمان پاك دەکاتەوە لە تاوانەکان).

مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە: ئەو موسڵمانەی کە خوا بە تەنها پەرستەو تاوانی گەورەی هەیە، ئەگەر خوای پەروەردگار لێی خۆش نەبێت ئەوە بە پێی تاوانەکەی سزا دەدرێت و پاشان ڕزگاری دەبێت لە دۆزەخ و بە هەمیشەیی تیایدا نامێنێتەوە، بۆیە پێویستە موسڵمان خۆی بپارێزێت لە

---

[٢٠٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٠٢/٢)، والبخاري (٥٢٨)، ومسلم (٦٦٧)، والترمذي (٢٨٦٨)، والنسائي (٤٦٢)، وابن ماجه (١٣٩٧)، والدارمي (١١٨٣).

تاوانە گەورەکان، وە زۆر بە خێرایی تەوبەی لێبکات ئەگەر هەر یەکێکیانی کردووەو کەوتۆتە ناوی.

**ئەو تاوانە گەورانەی کە زۆربەی خەڵکی تێی کەوتوونەو گوێی پێنادەن ئەمانەن:**

**١. ڕیا کردن لە کردنی کارە چاکەکان و نەبوونی دڵسۆزی تیایدا:**

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى فِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلاثَةٌ: رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأَتَى بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِي سَبِيلِكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ إِنَّمَا أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلانٌ جَرِيءٌ فَقَدْ قِيلَ، فَأَمَرَ بِهِ فَيُسْحَبُ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأَتَى بِهِ اللَّهَ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَقَرَأْتُ الْقُرْآنَ وَعَلَّمْتُهُ فِيكَ، قَالَ: كَذَبْتَ إِنَّمَا أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلانٌ عَالِمٌ، وَفُلانٌ قَارِئٌ، وَقَدْ قِيلَ فَأَمَرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ أَنْوَاعَ الْمَالِ فَأَتَى بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، فَقَالَ: مَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ فَقَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ شَيْءٍ تُحِبُّ أَنْ أُنْفِقَ فِيهِ إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهِ لَكَ، قَالَ: كَذَبْتَ إِنَّمَا أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلانٌ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ فَأَمَرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ))، وفي رواية عند التِّرمذي أنَّ النَّبيَّ (ﷺ) قال: ((أُولَئِكَ الثَّلاثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ الله تُسَعَّرُ بِهِمْ النَّارُ)) [٢٠٣].

---

[٢٠٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٢٣/١٩)، ومسلم واللفظ له (١٩٠٥) والنسائي (٣١٣٧)، والترمذي (٢٣٨٢)، والحاكم (٥٧٩/١)، وإبن خزيمة.

واتە: یەکەم کەس و کۆمەڵ لە دواڕۆژدا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت سێ کۆمەڵن (سێ کەسن):

**یەکەم:** پیاوێکە شەهید کراوە، ئەم پیاوە دەهێنرێت و نیعمەتەکانی خوای گەورەی بە ڕوودا دەدرێتەوەو ئەویش هەمووی دێتەوە یاد، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: چیت کرد بەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پێم بەخشیبووی؟ ئەویش دەڵێت: جیهادم کردو تێمکۆشا لە پێناوی تۆدا تا شەهید کرام، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: درۆت کرد جەنگایت تا پێت بووترێت: فلانەکەس ئازایە، وە پێت وترا ئازایە لە دونیادا، پاشان فەرمان دەکرێت بە ڕاکێشانی بۆ ناو دۆزەخ، بەسەر سەرا ڕائەکێشرێت تا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

**دووەم:** پیاوێکە زانست و زانیاری شەرعی فێر بووەو قورئان خوێن بووەو خەڵکیشی فێرکردووە، ئەم پیاوەش دەهێنرێت و نیعمەتەکانی خوای گەورەی بە ڕوودا دەدرێتەوەو ئەویش هەمووی دێتەوە یاد، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: چیت کرد بەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پێم بەخشیبووی؟ ئەویش دەڵێت: زانست و زانیاری فێر بووم و خەڵکیشم فێرکردو قورئانیشم خوێند لەبەر خاتری تۆ ئەی خوایە، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: درۆت کرد زانست و زانیاری فێربوویت تا پێت بووترێت: زانایە، وە پێت وترا لە دونیادا، وە قورئانت خوێند تا پێت بووترێت: قورئان خوێنە، وە پێت وترا لە دونیادا، پاشان فەرمان دەکرێت بە ڕاکێشانی بۆ ناو دۆزەخ، بەسەر سەرا ڕادەکێشرێت تا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

**سێیەم:** پیاوێکە خوای پەروەردگار دەوڵەمەندی کردووەو چەندین جۆر ماڵی پێبەخشیوە، ئەم پیاوەش دەهێنرێت و نیعمەتەکانی خوای گەورەی بە ڕوودا دەدرێتەوەو ئەویش هەمووی دێتەوە یاد، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: چیت کرد بەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پێم بەخشیبووی؟ ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار هیچ ڕێگەیەکی خێرو چاکە نەمابوو کە تۆ حەز بکەیت تیایدا ببەخشرێت ئیللا لەبەر خاتری تۆ ماڵم تیا بەخشی، خوای پەروەردگار پێی دەڵێت: درۆت کرد ماڵت دەبەخشی و خێرت دەکرد تا پێت بووترێت: فلانەکەس بەخشندەو خێرخوازە، وە پێت ووترا لە دونیادا، پاشان فەرمان دەکرێت بە ڕاکێشانی بۆ ناو دۆزەخ، بەسەر سەرا ڕائەکێشرێت تا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی التّرمـذي دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی أبوهريرة ئەم سێ کۆمەڵە یەکەم کۆمەڵ و دروست کراوی خوای پەروەردگارن کە ئاگری دۆزەخیان پێ گەرم و داخ دەکرێت و دەسووتێندرێن، (قورئان خوێنێک، تێکۆشەرێك، خێرخوازێك، ئەو کارە باشانەیان کردووە بۆ ئەوەی پێیان بووترێت: فلانەکەس قورئان خوێن بووە، فلانەکەس ئازا بووە، فلانەکەس بەخشندەو خێرخواز بووە، کردەوەکانیان تەنها لەبەر خاتری خوای پەروەردگار نەبووە، بەڵکو بۆ ڕیاو خۆ دەرخستن بووە).

هەر بۆیە هاوەڵی بەڕێز أبـو هُريـرة (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە دەبورایەوەو لە هۆش خۆی دەچوو.

وە هەروەها هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) أبوهريرة (خوای لێ ڕازی بێت)

فەرمودەیەکی ترمان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((مَنْ تَعَلَّمَ العِلمَ لِيُباهِيَ بِهِ العُلَماءَ، وَ يُـجارِيَ بِهِ السُّفَهاءَ، وَ يَصْرِفَ بِهِ وجوهَ الناسِ إلَيه، اَدْخَلَهُ اللهُ جَهَنَّمَ)) [٢٠٤].

واتە: هەرکەسێك فێری عیلم و زانیاری شەرعی ببێت بۆ خۆ ڕادان و شانازی کردن بەسەر زانایاندا، وە بۆ دەمە دەمێ و موناقەشە کردن لە گەڵ کەسانی بێعیلم و نەزاندا تا گومانیان بۆ دروست بکات، وە بە هۆی فێربوونی عیلم و زانیاری شەرعییەوە ڕووی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت (بۆ ئەوەی بەردەوام لەسەرووی خەڵکەوە بێت یان زیاتر ڕێز لێگیراو بێت)، هەر کەسێك ئەو کارە بکات (عیلم و زانیاری شەرعی فێر بێت بە مەبەستی یەکێك لەو سێ شتە) ئەوە بێگومان خوای پەروەردگار دەیخاتە ناو دۆزەخەوە.

## ٢. وێنە گرتن:

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يَخْرُجُ عُنُقٌ مِنْ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَأُذُنَانِ يَسْمَعُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، فَيَقُولُ: إِنِّي وُكِّلْتُ بِثَلَاثَةٍ بِكُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ، وَبِكُلِّ مَنْ ادَّعَى مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ، وَالْمُصَوِّرِينَ)) [٢٠٥].

---

[٢٠٤] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١/١٦٤)، وابن ماجه واللفظ له (٢٦٠)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": صحيح لغيره (١١٠).

[٢٠٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٤/١٦٨)، والترمذي واللفظ له (٢٥٧٤)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٨٠٥١).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتـدا ملێك لـە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە دەردەچێت، دوو چاوی هەیە پێی دەبینێت، دوو گوێی هەیە پێی دەبیستێت، زمـانێکی هەیـە قسەی پێدەکات و دەڵێت: من شەرپشك کراوم و ڕێگە پێـدراوم بـە ڕاکێشانی سێ کۆمـەڵ کـەس بـۆ نـاو ئـاگری دۆزەخ: هـەموو کەسێکی خـۆ بـەزل زانـی ئینکارکەر لـە حـەق، وە هـەموو ئـەو کەسـانەی لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا هاوار بۆ پەرستراوی تر دەکەن (موشریکین)، وە هەموو وێنەگرو وێنەکێشێك.

سَعید کوڕی أبو الحَسَن (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: جارێکیان پیاوێك هات بۆلای إبنُ عَبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) پێی ووت: من ئەم وێنانە دەکێشم (وێنەی ڕوح لەبەران) جا بۆم ڕوون بکەوە ئایا دروستە یان نا؟ إبنُ عبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) پێی ووت: نزیك بەرەوە لێم، پیاوەکە لێی نزیك بووەوە، دووبارە إبنُ عبّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) پێی ووت: نزیك بەرەوە لێم، پیاوەکە لێی نزیك بووەوە تا إبنُ عباس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەستی خستە سەر سەری و پێی ووت: ئەوەت بۆ باس دەکەم کە خۆم لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە*، بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((کُلُّ مُصَوِّرٍ فِي

---

* موسڵمانی ڕاستەقینە دەبێت وەکو إبنُ عَبّاس بێت (خوایان لێ ڕازی بێت)، تەنها فەرموودەی خوای پەروەردگارو پێغەمبەر (ﷺ)، باس بکات و فەتوای پێبدات، نەك ووتەی ئەم و ئەو، بە تایبەتی لەو باسانەی کە خیلافی زۆری تیا دروست بووە لەم سەردەمەدا، وەکو: گۆرانی و مۆسیقاو وێنەگرتن و ڕیش تاشین و جل و بەرگ شۆڕکردنەوە بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان (بۆ پیاوان)، وە حەڵاڵ کردنی پانتۆڵ و دەم و چاوو برۆ هەڵگرتن بۆ ئافرەتان،......، ئەگەر تۆ موسڵمانی ڕاستەقینە بیت و بتەوێت بەڕاستی شوێنی قورئانی پیرۆزو فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەویت، ئەوە بۆت دەردەکەوێت هەموو ئەم شتانەو چەندین شتی تر کە لە بنەڕەتدا حەرامە، بەڵام بە ووتەو فەتوای ئەم و ئەو حەڵاڵ کراوە، نەك بە فەرموودەی خوای پەروەردگارو پێغەمبەر (ﷺ).

النَّارِ يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ. وَقَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً، فَاصْنَعِ الشَّجَرَ، وَمَا لاَ نَفْسَ لَهُ)) [٢٠٦].

واته: هەموو وێنەگرو وێنەكێشێك لە ئاگری دۆزەخدایە، هەر وێنەیەك كە كێشاوێتی لە دونیادا دەكرێت بە ڕوح لەبەرێك و سزای (وێنەگرو وێنەكێشەكە) دەدات، إبنُ عبَّاس (خوایان لێ ڕازی بێت) بە پیاوەكەی ووت: ئەگەر تۆ هەر وێنەكێشی و وێنە دەكێشیت، ئەوە وێنەی دارو درەخت و ئەو شتانە بكێشە كە ڕوح لەبەر نین (واتە: وێنەی شاخ و كێوو ڕووبارو ... هتد).

موسڵمانی خۆشەویست ئاگاداربەو خۆت بپارێزە لە دروست كردنی پەیكەرو وێنەی مرۆڤ و ڕوح لەبەران، یان گۆڕینی وێنەكان بە گاڵتە كردن بە شێوەو ڕوخساریان بە بڕین و پێكەوە نانیان لە ڕێگەی بەرنامەی كۆمپیوتەرو مۆبایل و هۆكارەكانی تر، كە زۆربەی خەڵكی بە چاوی سووكەوە سەیری دەكەن و كردوویانەتە هۆكاری گاڵتە ئامێزو كاتی پێ بەسەر دەبەن.

وە هەروەها خۆت بپارێزە لە وێنە گرتن و مەڵێ كاتی خۆی بە دەست وێنە كێشراوە، ئێستا بە كامێراو ئامێری پێشكەوتوو دەگیرێت و حوكمی وێنە كێشانی نییە.

نەخێر وا نییە، موسڵمانی خۆشەویست پێت دەڵێم: خۆتی لێ بپارێزە تا هەڕەشەی ئەو فەرموودانەی سەرەوەو چەندین فەرموودەی صەحیحی تری پێغەمبەر (ﷺ) نەتگرێتەوە، خۆ ئەگەر دەڵێیت: بابەتەكە بابەتێكی خیلافییەو زانایانی سەردەم بۆچوونیان جیاوازە لەسەر دروستێتی و

---

[٢٠٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٧٧/١٧)، والبخاري (٢٢٢٥)، ومسلم واللفظ له (٢١١٠)، والترمذي (١٧٥١)، والنسائي (٥٣٥٨)، وأبو داود (٥٠٢٤).

نادروستێتی (وێنەگرتن)، بەڵێ منیش لەگەڵتام کە زانایانی سەردەم بۆچوونیان جیاوازە لەسەر دروستێتی و نادروستێتی، بەڵام مەرج نییە هەر بابەتێکی شەرعی زانایان بۆچوونیان جیاواز بوو تیایدا تۆ بڵێت: کامیان ئاسانترو گونجاوترو خۆشترە ئەوەیان ئەنجام دەدەم، چونکە حەق هەرگیز یەکەو لای کۆمەڵێکیانە نەك لای هەردوو لایان، وە ئەگەر شوێنی خیلافی بێ بنەماو بێ بەڵگە بکەویت ئەوە سەرت لێدەشێوێت و موسڵمانێکی حەق ویست نابیت، لەبەر ئەوەی ئەو زانایانەی کە دەڵێن: وێنەگرتن دروست نییەو لە تاوانە گەورەکانە، بەڵگەیان هەم فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرەو (ﷺ)، هەم بۆچوونی ڕاست و دروستی خۆیان و زانایانی پێش خۆیانە، کە ئەمەش تەواو گونجاوترە لەگەڵ حوکم و مەبەستەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی تاوان و هەموو خراپەکارییەك، بە تایبەتی لەم سەردەمەدا کە هەموو جۆرە خراپەو تاوانێك بەربڵاوەو موسڵمانان تێکەوتوونە جا نەزانن ئەو کارە حەرامە، یان بشزانن حەرامە هەر دەیکەن و گوێی پێنادەن کە ئەم لایەنەیان زیاترە، چونکە موسڵمان زۆربەی بابەتەکانی حەرام و حەڵاڵی بۆ ڕوون بووەتەوە، بەڵام لەم سەردەمەدا تاوان کردن و گوێ نەدان بە حەرام و حەڵاڵ لە هەموو کات و سەردەمێك زیاترە، وە زۆربەی وێنەگرتنەکان پیاوان و ئافرەتان بە تێکەڵاوی دەیگرن و بێ ئەوەی مەحرەمی یەکتریش بن، ئافرەتان بە سەری ڕووت و جل و بەرگی ناشەرعی و شان بە شانی پیاوان وێنە دەگرن، دواتریش مەگەر تەنها خوای پەروەردگار بزانێت ئەو وێنانە چییان لێدەکرێت و چۆن بەناو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە.

زانای پایەبەرز الشّوكانِـــي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دوای ئەوەی خیلافی نێوان زانایان باس دەكات سەبارەت بەگۆرانی، دەڵێت: پاش ئەوەی بەڵگەی هەردوولامان باس كرد سەبارەت بە گۆرانی، ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت ئەگەر خیلافی نێوان زانایان لە بازنەی حەرامیش دەرچێت ئەوە لە بازنەی شوبهەو گومان دەرناچێت (لەم باسەدا: باسی گۆرانی)، وە ئیماندارانیش وەستاون بەرامبەر ئەو فەرموودانەی كە ماناكەی تەواو ئاشكراو دیار نییە (هەرچەندە ئەم باسە حوكمی ڕوون و ئاشكرایە لای زانایانی ڕاستەقینەو موسڵمانی شوێن كەوتووی حەق)، وە هەروەها لە فەرموودەیەكی صەحیحدا هاتووە كە شتە حەڵاڵەكان ڕوون و ئاشكراو دیارن، وە شتە حەرامەكانیش بەهەمان شێوە، وە لە نێوانیاندا چەند كارو شتێك هەیە ماناو واتاكەی بە ڕوون و ئاشكرایی لە هەموو كەسێك دیارنییە، هەر موسڵمانێك خۆی بپارێزێت لێیان ئەوە دینەكەی سەلامەت دەبێت و خۆی دوورخستۆتەوە لە توانج و قسەو قسەڵۆك و گومانی خەڵكی [٢٠٧].

موسڵمانی خۆشەویست ووتەی زانای پایەبەرز ئیمامی الشّوكانِي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) تەواو وێنەگرتنیش دەگرێتەوە بە تایبەتی لەم سەردەمەدا، بۆیە خۆتی لێبپارێزەو مەیگرە ئەگەر فەتوای نادروستیشی لەسەر بێت.

---

[٢٠٧] بڕوانە: نيل الأوطار للعلاّمة الإمام الشّوكاني (٨/٥١١).

**٣. ووتنی ووتەیەك كە خوای پەروەردگاری پێ تووڕە دەبێت:**

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لاَ يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَرْفَعُ اللَّهُ بِهَا لَهُ دَرَجَاتٍ، وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لاَ يُلْقِي لَهَا بَالاً، يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ)) [٢٠٨].

واتە: بەندەی وا هەیە ووتەیەك دەڵێت بۆ ڕازی بوونی خوای پەروەردگار، ئەو بەندەیە ئەو ووتەیە زۆر بە گەورەیە نازانێت، بەڵام بەلای خوای پەروەردگارەوە زۆر خێرو گەورەیە، بۆیە چەندین پلە لە بەهەشتدا بەرزی دەکاتەوە بە هۆیەوە، وە بەندەی وا هەیە ووتەیەك دەڵێت کە خوای پەروەردگار پێی ناخۆشەو پێی تووڕە دەبێت، ئەم بەندەیە گوێ بەو ووتەیە نادات و زۆر بە گەورەی نازانێت، بەڵام بەلای خوای پەروەردگارەوە تاوانێکی زۆر گەورەیە، بۆیە بە هۆی ئەو قسەیەوە بەردەدرێتەوە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە هاوەڵی بەڕێز مُعاذِ کوڕی جَبَل (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ((كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي سَفَرٍ فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنْ النَّارِ؟ قَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أَدُلُّكَ

---

[٢٠٨] رواه الإمام مالك (١٨٤٩)، وأحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٦٩)، والبخاري (٦٤٧٨)، ومسلم (٢٩٨٨)، والترمذي (٢٣١٤).

عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ، الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، قَالَ: ثُمَّ تَلَا: (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ) حَتَّى بَلَغَ (يَعْمَلُونَ) ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُخْبِرُكَ بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ، فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ، قَالَ: كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا، فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ: وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟)) [٢٠٩].

واته: جارێكیان له سه‌فه‌رێكدا له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) بووم، تا ڕۆژێكیان به ڕێگادا ده‌ڕۆیشتین لێی نزیك بوومه‌وه‌و پێم ووت: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) هه‌واڵم پێبده به‌و كاره چاكانه‌ی كه ئه‌گه‌ر بیكه‌م پێی بچمه به‌هه‌شته‌وه، وه دوورم بخاته‌وه له ئاگری دۆزه‌خ، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی: به‌ڕاستی پرسیاری كارێكی زۆر گه‌وره‌ت لێكردم، به‌ڵام ئاسانه له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی كه خوای په‌روه‌ردگار له‌سه‌ری ئاسان بكات، (ئه‌و كاره چاكانه‌ی پێی بچیته به‌هه‌شته‌وه‌و دوور بكه‌ویته‌وه له ئاگری دۆزه‌خ) ئه‌مانه‌ن: خوای په‌روه‌ردگار به تاك و ته‌نها بپه‌رستیت و هیچ هاوه‌ڵ و شه‌ریكی بۆ بڕیار نه‌ده‌یت، وه نوێژ بكه‌یت، زه‌كاتی ماڵه‌كه‌ت ده‌ربكه‌یت، وه ڕۆژووی مانگی ڕه‌مه‌زان بگریت، حه‌جی ماڵی خوای په‌روه‌ردگار بكه‌یت، پاشان پێغه‌مبه‌ر

---

[٢٠٩] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٥٨)، والترمذي واللفظ له (٢٦١٦)، وابن ماجه (٣٩٧٣)، والحاكم (٢/٤٤٧)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٥١٣٦).

(ﷺ) فەرمووی: ئایا هەواڵت پێبدەم و پێت ڕابگەیەنم کە دەرگای خێرەکان چین؟ ڕۆژوو قەڵغانە (موسڵمان دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ)، وە خێرو صەدەقە تاوان دەسڕێتەوە هەروەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، وە شەونوێژ کردن لە جەرگەی شەودا، مُعاذ (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (تَتجافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ المَضاجِعِ) تا گەیشتە (يَعْمَلُونَ)، پاشان فەرمووی: ئایا هەواڵت پێبدەم بە سەرچاوەی هەموو کارە چاکەکان وە کۆڵەکەو لووتکەی بەرزی ئەم دینە؟ مُعاذ (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سەرچاوەی هەموو کارە چاکەکان ئیسلام بوونە (پێش کردنی هەر کارێکی چاکە دەبێت ئەو کەسە موسڵمان بێت ئەگەر بە تەمای خێرو پاداشتی دواڕۆژە)، وە کۆڵەکەی ئەم دینە نوێژ کردنە (بێ نوێژ کردن ئەو کەسە دینی نییە)، وە لووتکەی بەرزی ئەم ئیسلامە جیهادو تێکۆشانە لە پێناو خوای پەروەردگاردا، مُعاذ (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی مُعاذ (خوای لێ ڕازی بێت) ئایا هەواڵت پێبدەم بە کارێك کە کۆکەرەوەی هەموو ئەمانەیە؟ ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، مُعـــاذ (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) زمانی گرت و فەرمووی: خۆت لە شەڕو خراپەو تاوانی ئەمە بپارێزە، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئێمە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین سزا دەدرێین (لە سەر ووتەی خراپ و نابەجێ و تاوانی زمانمان)؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی لەبار دایکت بچویتایە، ئەمە گاڵتەیەك بووە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی کردوویەتی (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئایا کاتێك خەڵکی بەسەر دەم و

چاوو ڕویانا ڕادەکێشرێن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ هەمووی بە هۆی دروێنەی زمانیانەوە نییە (تاوانەکانی زمانیان)؟.

**٤. ئازاردانی دراوسێ:**

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: جارێکیان پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) فلانە ئافرەت باسی نوێژی زۆرو ڕۆژووی زۆرو خێری زۆری دەکرێت، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو ئافرەتە بە زمانی ئازاری دراوسێی دەدات (خراپە لەگەڵیاندا، هاوسێکانی بێوەی نین لە زمانی بەڵکو لە زمانی دەترسن)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هِيَ فِي النّارِ))، ئەو ئافرەتە لە ئاگری دۆزەخدایە، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) فلانە ئافرەت باسی کەم نوێژیی و کەم ڕۆژوویی و کەم خێری دەکرێت جاری وا هەیە (ووردە کەشك دەکات بە خێر)، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو ئافرەتە بە زمانی ئازاری دراوسێکانی نادات (باشە لەگەڵیاندا)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هِيَ فِي الجَنَّـةِ)) [٢١٠]، ئەو ئافرەتە لە بەهەشتدایە.

**٥. شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان:**

موسڵمانی خۆشەویست ئەم بابەتەش وەکو بابەتی وێنەگرتن و گۆرانی و مۆسیقاو چەندین بابەتی تر کەلەم دواییەدا خیلاف لە نێوان زانایان دروست

---

[٢١٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢١٩/١٩)، والحاكم (١٨٣/٤)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٢٥٦٠).

بووه لەسەر دروستێتی و حەرامێتی، ئایا شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان (بۆ پیاوان) حەرام و تاوانە یان نا؟

موسڵمانی خۆشەویست ئەگەر بۆ فیزو تەکەبوور بێت ئەوە هەموویان یەکدەنگن لەسەر حەرامێتی ونادروستێتی، وە تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، بەڵام ئەگەر بۆ خۆ ڕادان و فیزو تەکەبوور نەبێت ئایا هەر تاوانەو حەرامە؟ فەرموودەکان هەندێکیان بە ڕەهایی (مُطْلَقْ) هاتوونەو هەندێکیان بە دیاری کراوی (مُقَيَّدْ) هاتوونە لەسەر حوکم و سزای شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان، بەڵام ئەگەر ووردبینەوە لە هۆکاری شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان، وە سزای هەر دوو جۆرە شۆڕ کردنەوەکە (بۆ فیزو تەکەبوور بێت یان نا) ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بە هەموو شێوەیەك شۆڕکردنەوەی جل و بەرگ بۆ ژێر قاپە ڕەقەی پێیەکان حەرامەو تاوانە (جا خۆتی لێبپارێزەو گوێ مەدە بە قسەی ئەم و ئەو کە گوایە حەڵاڵەو دروستە ئەگەر بۆ فیزو تەکەبوور نەبێت).

هاوەڵی بەڕێز هبيب الغفاري (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ وَطِئَ عَلى إزارِهِ خُيَلاءَ وَطِئَ فِي نارِ جَهَنَّمَ)) [٢١١].

واتە: هەر کەسێك جل و بەرگی لەبەر کردو شۆڕی کردەوە بۆ فیزو تەکەبوور ئەوە پێیەکانی خستۆتە ئاگری دۆزەخەوە.

وە هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا أَسْفَلَ مِنَ الكَعْبَينِ مِنَ الإزارِ فَفِي النَّارِ)) [٢١٢].

---

[٢١١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧/٢٩٠)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٥٩٢).

واتە: هەر جل و بەرگێك لە ژێر قاپە ڕەقەی پێوە بێت ئەوە ئەو پێیانە لە ئاگری دۆزەخدایە.

**٦. پاڵدانە لای زاڵم و ستەمکاران و ڕازی بوون بە کارەکەیان:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ (هود: ١١٣).

واتە: خۆتان مەدەنە پاڵ و زاڵم و ستەمکاران و ڕازی مەبن بە کارەکەیان، خۆ ئەگەر واتان کرد ئەوە ئاگری دۆزەخ دەتان گرێت و دەتان سووتێنێت، ئەو کاتە جگە لە خوای پەروەردگار هیچ دۆست و خۆشەویستێکتان نییە، وە پاشان سەر ناکەوێنرێن لە لایەن ستەمکارانەوە (کاتێك ئاگری دۆزەخ گرتانی).

**٧. دەرنەکردنی زەکات:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ

---

[٢١٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٧/٢٣٥)، والبخاري واللفظ له (٥٧٨٧)، والنسائي (٥٣٣١)، وابن ماجه (٣٥٧٣).

وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾

﴾ (التوبة: ٣٤ - ٣٥).

واتـە: ئـەی ئیمانـداران ئاگـادار بـن و بـاش بـزانن کـە زۆرێـك لـە قەشـەو (فرەزانەکانی جولەکە) پاپاکان (گۆشەگیرو ڕەبەنە فەلـەکان) مـاڵ و سـامانی خەڵکی دەخۆن بـە ناحـەق و بـە تـاڵانی دەبـەن، وە ڕێگریـشیان لێدەکـەن و ناهێڵن دینـی ئیـسلام قـەبووڵ بکـەن، ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ وە ئـەو کەسـانەی کـە زێـڕو زیـو کـۆ دەکەنـەوەو نایبەخشن لە ڕێی خوادا، ئـەوە تـۆ ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ مژدەیان پێبدە بـە سـزایەکی ئـێش پێکەیەنـەر، ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْۖ﴾ لـە ڕۆژێکـدا ئـەو زێـڕو زیوە لە ناو ئاگری دۆزەخدا سـوور دەکرێتـەوەو گـەرم و داخ دەکرێـت و نێـو چاوو تەنیشتەکان و پشتیانی پێداخ دەکرێـت و پێیـان دەووترێـت: ﴿هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ ئەمە ئەو زێڕو زیوەیە کە خڕتان کـردەوە بـۆ خۆتـان و نـەتان بەخـشی لـە ڕێـی خـوای پـەروەردگاردا، دەی کەوابوو ئێستا سزاکەی بچێژن.

## ٨. پشت هەڵکردن لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەی دوژمن:

خوای پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ

﴿ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾ (الأنفال: ١٥ - ١٦).

واتە: ئەی ئیمانداران کاتێك لە مەیدانی جەنگدا بوون و تووشی بێباوەڕان بوون و بەزۆری هێرشیان بۆ دەهێنان و لێتان نزیك دەبوونەوە، نابێت پشتیان تێبکەن و هەڵبێن و ڕابکەن، بەڵکو خۆ ڕاگر بن و بەرامبەریان بوەستن، چونکە ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ ﴾ هەرکەسێك لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا پشت هەڵبکات و خۆی بدزێتەوەو شوێنیان بۆ چۆڵ بکات، بە ڕاستی تورەیی خوای پەروەردگاری دەکەوێتە سەرو جێگاشی دۆزەخ دەبێت، ﴿ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ ﴾ مەگەر کەسێك بۆ شەڕ کردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە مەبەستی ئەوەی جارێکی تر خۆی ئامادە بکاتەوە بۆ هێرش بردن، یان بۆ ئەوەی فێڵ لە بێباوەڕان بکات و خێرا بگەڕێتەوە سەریان بۆ جەنگ، یان جێگۆڕکێ بکات تا خۆی بگەیەنێتە تاقمێکی تری جەنگاوەران، بۆ ئەوەی هەموویان بە کۆمەڵی بجەنگن، ئەوە قەیدی نییە لەم حاڵەتانەدا، بەڵام ئەگەر لە کاتی ڕوبەڕوبونەوەی دوژمندا پشت هەڵبکات و خۆی بدزێتەوەو شوێنیان بۆ چۆڵ بکات لە ترسان یان بە مەبەستی زاڵ بوونی دوژمن بەسەر موسڵمانانداا ئەوە ﴿ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ﴾ بە ڕاستی تورەیی خوای پەروەردگاری دەکەوێتە سەرو جێگاشی دۆزەخ دەبێت، بەڕاستی دۆزەخیش چارەنوسێکی زۆر خراپە.

### ٩. پۆشینی جل و بەرگی ناشەرعی بۆ ئافرەتان:

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لیّ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مَائِلاَتٌ مُمِيلاَتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَمْثَالِ أَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ كَذَا وَكَذَا)) [٢١٣].

واتە: دوو تاقم و کۆمەڵ هەن ئەهلی ئاگری دۆزەخن کە من نەیانم بینیوە (چونکە لەسەردەمی ئەودا نەبوونە): کۆمەڵێکیان کەسانێکن قامچیان بە دەستەوەیە بە وێنەی کلکی مانگا خەڵکی پێ ئازار دەدەن (واتە: جەلادەکان)، وە تاقم و کۆمەڵی دووەمیان ئافرەتانێکن جل و بەرگیان لەبەردایە بەڵام ڕووتن (جل و بەرگیان تەنگ و تەسك و کورت و کون کونە کە لاشەیان دەردەخات)، بە لەنجەولار دەڕۆن و خۆیان با دەدەن، قژی سەریان بە وێنەی کۆپانەی سەر پشتی ووشتر لار بۆتەوە (سەریان ڕووت دەکەن و بە تۆپەڵ دەیبەستن لەسەر تەوقی سەریان، لەچکی چی و حیجابی چی؟)، ئەو ئافرەتانەی ئەوە حاڵیانە ناچنە بەهەشتەوەو بۆن و بەرامی خۆشی بەهەشتیش ناکەن، لە کاتێکدا بۆن و بەرامی خۆشی بەهەشت دووری ئەوەندەو ئەوەندە ساڵە دەڕوات (پێنج سەد ساڵ).

بەڵێ ئەی پێغەمبەری (ﷺ) خۆشەویست ئەو دوو کۆمەڵە لە خوا نەترسە نەبوونە لە سەردەمی تۆو هاوەڵانی بەڕێزت و پێشینی چاکەخواز (ڕەحمەتی

---

[٢١٣] رواه الإمام مالك (١٦٩٤)، وأحمد "الفتح الرباني" (١٧/٣٠٢)، ومسلم واللفظ له (٢١٢٨).

خوایـان لێبێـت) کـه بـه ڕاسـتی تـه‌نها شـوێنکه‌وتووی قورئـان و فـه‌رمووده صه‌حیحه‌کانی تۆی خۆشه‌ویست بوونه، ده‌بـێ بڵـێین: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾﴾ ( البقـــرة: ١٥٦)، بـۆ دووری و گوێنـه‌دانی زۆربـه‌ی موسـڵمانان بـه فه‌رمانه‌کانی خوای پـه‌روه‌ردگار و پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ)، زیـاتر ئافره‌تـان لـه ڕووی پۆشینی جل و به‌رگی ناشـه‌رعی و ده‌رخـستنی لـه‌ش و لاریـان، کـه بوونه‌تـه مایه‌ی فیتنه‌و فه‌ساد بۆ زۆرێك له گه‌نجان و ڕاكێشانیان بۆ ناو ئاگری دۆزه‌خ، ده‌بێ چی غیره‌تێك له‌و باوك و برا و مێرده‌یا هه‌بێت كه ده‌بیـنن ئافره‌تانیـان ئـه‌و جـل و به‌رگـه ناشـه‌رعییه ده‌پۆشـن و ڕێگریـان لێناكـه‌ن؟ لـه كاتێكـدا زۆربه‌شیان نوێژخوێن و ڕۆژوو گروو مامـه حاجیـشن!!! ده‌بـێ ئـه‌و كه‌سـانه چی دڵێكیان به‌و نوێـژ و ڕۆژوو و حه‌جـه‌یان خـۆش بێـت؟ لـه كاتێكدا ئـه‌وها گوێ ناده‌ن به نرخترین زێرو گه‌وهه‌ریان كه ئافره‌تانیانن، زۆربه‌ی ئافره‌تـانی ئه‌م ڕۆژگاره به‌جۆره‌ها مۆدیل و جل و به‌رگی ناشه‌رعی خۆیـان ده‌ڕازێننـه‌وه بۆ پیاوانی بێگانه، بێ ئه‌وه‌ی گوێ بده‌نه فه‌رمانـه‌كانی خـوای پـه‌روه‌ردگار و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، عابای چی و حیجابی چی و له‌چكی چـی؟ ئه‌مانـه هـه‌مووی هی ئیـسلامه‌و ڕۆیـشت و به‌سـه‌ر چـوو مـۆدیلی نه‌ماوه لایـان، ئێـستا ده‌وری مۆدیلی غه‌رب و گاورو جوله‌كه‌یه، خۆپۆشـته كـردن و جـل و بـه‌رگی شـه‌رعی له‌به‌ر كردن، دواكه‌وتنه به‌لای ئه‌وانه‌وه، وه ده‌ڵێن: به كـه‌ڵكی ئـه‌مڕۆ نایـات، ئه‌گه‌ر ئه‌و ئافره‌تانه به زمانیشیان وا نه‌ڵێن، ئه‌وه به زمانی حاڵیان وا ده‌ڵـێن (باڵاو جل و به‌رگیان وا ده‌ڵێت، له به‌ر كردنـی پـانتۆڵ و تـه‌نووره‌ی ته‌سـك و كورت و سترێج .....هتد)، هه‌رچۆنێك بێت ئه‌مـه حـاڵی ئافره‌تانێكه كـه یـان باوه‌ڕیان به خـوای په‌روه‌ردگارنییه، یان هه‌ر لێی ناترسن، یـان ئه‌گـه‌ر لێشی

بترسن ئـەوە ترسيان كەمـە و ئيمانيـان لاوازە، بـەلآم هەنـدێ لـە خوشـكانی حیجاب لەبەر (هەر بە ناو) حیجابەکەیان یان تەسـکەو لاشـەیان دەردەخـات، یـان مانتۆیـە، یـان بریـق وبـاقی پێوەیـە، یـان لەسـەر مۆدیلـەو مەرجـەکانی حیجابی تیانییە.

بۆیە بە هەموو خوشکێکی بەڕێز دەڵێم: زۆر ئاگاداری جل و بـەرگتان بـن و جوانی خۆتان،دەرمەخەن بۆ پیاوانی بێگانە، خۆتان مەکەنـە نێـچیری گورگـە برسییە لە خوا نەترسەکان، خۆتان مەخەنـە بـەر هەڕەشـەو نـەفرەتی خـوای پەروەردگار و پێغەمبـەر (ﷺ) و فریـشتەکان و سـەرجەم موسـڵمانان، بـەڵکو خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ، ئەو ئـاگرەی کـە سـووتەمەنییەکەی مرۆڤـــ و بەردی کبریتە، ئاگرێکە شەست و نۆجار (یان نەوەدو نۆ جار) گەرمترە لـە ئاگری دونیا کە هیچ کەس تەحەمولی ناکات و بەرگەی ناگرێت، ئایا ئێـوەی بێدەسـەلآت بەرگـەی دەگـرن؟ نـا، سـوێند بـە خـوای پـەروەردگار بـەردو ئاسنیش بەرگەی ناگرێت، دەی کەوابوو ئەگـەر تـا ئێـستا بـێ ئاگـا بوویتـە و نەتزانیوە یان گوێت پێنەداوە، ئەوە هـەر لـە ئێـستاوە هـەوڵ بـدەو خـەم لـە خـۆت بخـۆ، چـونکە هەنـدێ جـار بـۆ ژیـانی دواڕۆژت تـەنها مامۆسـتایان و کەسانی چاکەخواز دڵسۆزتن، نەك ئەو باوك و براو مێردەی کە بەبەر چـاویانە جل و بەرگی ناشەرعی دەپۆشیت، گوێی پێنادەن و ڕێت لێناگرن و لە ئـاگری دۆزەخ ناتپارێن لە کاتێکدا پێغەمبـەر (ﷺ) هـەواڵی داوەو پێـی ڕاگەیانـدووین ئـەو ئافرەتانـەی جـل و بـەرگیان لەبەردایـە بـەلآم ڕووتـن، وە بـە لەنجـەولار دەڕۆن و خۆیان با دەدەن، قـژی سـەریان بـە وێنـەی کۆپانـەی سـەر پـشتی ووشتر لار بۆتـەوە، بـۆنی بەهەشـت ناکـەن و ناچـنە بەهەشـتەوە، پێغەمبـەر

(ﷺ) وا دەفەرمووێت و وا فەرمان دەكات، باوك و براو مێردەكانیش ئاوهـان و گوێی پێنادەن و بێدەنگن بەرامبەرتان.

سُلَیمانِ كوڕی یَسار (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: باشترینی ئافرەتانتان ئـەو ئافرەتانـەن كـە منـداڵیان دەبێـت و مێردەكانیـان خـۆش دەوێـت و قـسەو بۆچوونیان لەگەڵ قسەی مێردەكانیاندایە، وە لەگـەڵ ئەوەشـدا تـەقوای خـوا دەكەن و لێی دەترسن، وە خراپترینی ئافرەتانتان ئەو ئافرەتانەن كـە جـل و بەرگی ناشەرعی دەپۆشن و سافرەن و خۆ بەزل زانن، ئەو ئافرەتانـەی ئـەوە حاڵیانـە ئافرەتـانێكی دووڕوو و لـە سـنوری خـوا دەرچـوون، ئـەو ئافرەتانـە لێیان ناچێتە بەهەشتەوە مەگـەر بـە وێنـەی قەلەڕەشـی پـێ سـپی (كـە ئـەم جـۆرە قەلەڕەشـە زۆر كەمـە)، واتـە: ئـەو ئافرەتـە موسـڵمانانەی كـە جـل و بەرگی ناشەرعی دەپۆشن زۆریان دەچـنە دۆزەخـەوە، كـەمیان هەیـە بـچێتە بەهەشـتەوە، مـەرج نییـە ئـەو ئافرەتانـە كـافرو بێبـاوەڕ بـن، نـەخێر بـەڵكو ئافرەتـانێكن هەنـدێكیان موسڵمانیـشن نوێـژیش دەكـەن و ڕۆژوش دەگـرن و چاكەش دەكەن و جـل و بەرگیـشیان لەبەردایـە، بـەڵام ڕووتـن (واتـە: جـل و بەرگیان تەنگ و تەسك و كورت و كون كونە كـە لاشـەیان دەردەخـات)، دەی كەوابوو خوشكی موسڵمانی سافرەی بێئاگا خۆت بپارێزە لـە ئـاگری دۆزەخ، ئـەو ئـاگرەی كـە سـووتەمەنییەكی تـۆی بێدەسـەڵات و بـەردە، وە ئاگرێكـە نەوەدو نۆ جار گەرمترو سوتێنەرترە لە ئاگری دونیا [٢١٤].

---

[٢١٤] رواه البيهقي، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٣٣٣٠).

**١٠. ئەوانەی کە فەرمان دەکەن بە چاکەو خۆیان نایکەن، وە بە خەڵکی دەڵێن ئەوە خراپەیەو مەیکەن بەڵام خۆیان دەیکەن:**

هاوەڵی بەڕێز أسامة کوڕی زَیـــــد (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ فِي النَّارِ فَيَدُورُ كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِرَحَاهُ، فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عَلَيْهِ فَيَقُولُونَ: أَيْ فُلَانُ مَا شَأْنُكَ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عَنْ الْمُنْكَرِ؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُكُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا آتِيهِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ))[٢١٥].

واتە: لە ڕۆژی دواییدا پیاوێك دەهێندرێت و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ڕیخۆڵەی بەردەبێتەوە بەر پێی و بە دەوریا دەسوڕێتەوە وەکو گوێ درێژ کاتێك گێرە دەکات چۆن بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، ئەهلی ناو دۆزەخ لێی کۆ دەبنەوەو پێی دەڵێن: ئەی فلان کەس چیتە بۆ وات لێهاتووە چیت لێ قەوماوە؟ ئایا تۆ لە دونیادا پێمانت نەدەووت: ئەوە چاکەیە بیکەن و ئەوە خراپەیە مەیکەن؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، پێتانم دەووت: ئەوە چاکەیە بیکەن بەڵام خۆم نەمدەکرد، وە پێتانم دەووت: ئەوە خراپەیە مەیکەن و لێی دوور بکەونەوە، بەڵام خۆم دەمکرد.

موسڵمانی خۆشەویست ئەگەر تۆزێ بە ووردی بڕوانیتە فەرموودەکە ئەوەت بۆ دەردەکەوێت، کەسانێك لەناو ئاگری دۆزەخدا دەسووتێن، تەنها ئاگری دۆزەخیان بەسە بۆ سزاو سووتانیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵە کەسێك لێی کۆبوونەتەوە (لە کاتێکدا ڕیخۆڵەی بەربۆتەوە بەر پێی و بە دەوریا

---

[٢١٥] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/١٧٢)، والبخاري واللفظ له (٣٢٦٧)، ومسلم (٢٩٨٩).

دەسوڕێتەوە وەکو گوێ درێژ کاتێك گێرە دەکات چۆن بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە)، کە ئەویش بەڵگەیە لەسەر ناشرینی تاوانەکەیی و توندی سزاکەی، وە شوبهێنراوە بە گوێ درێژیش، چونکە هیچ نەفامی و نەزانیەك لەوە گەورەتر نییە کە کەسێك حەق بزانێت و خەڵکیشی بۆلا بانگ بکات، بەڵام خۆی کاری پێنەکات، وە ئەو گفتوگۆیەی لە نێوانیاندا دەکرێت گفتوگۆیەکی ئاسایی نییە، بەڵکو پڕە لە هاوارو ڕۆڕۆو سزای بە ئێش، خوای پەروەردگار کۆی کردونەتەوەو گفتۆگۆ دەکەن و دەسوتێن و سزاشیان لەسەرە، بۆ ڕیسوا بوونیان و دان نان بە تاوانەکانیان.

موسڵمانی خۆشەویست جوان وورد بەوە لە فەرموودەکە چۆن خوای پەروەردگار ئەو بانگەوازکارەو هەندێك لە شوێن کەوتوانی بە یەکەوە کۆ کردۆتەوە لە ناو دۆزەخدا تا زیاتر سەرشۆڕ بن ، چونکە لە دونیادا گوێیان لە ئامۆژگارییەکانی گرتووە بەڵام گوێیان پێنەداوەو بە قسەیان نەکردووە، ئەوانەی سزا دەدرێن دوو کۆمەڵن: یەکەم: کەسانێك حەقیان زانیوەو خەڵکیشیان فێر کردووە، بەڵام کاریان پێنەکردووە، دووەم: کەسانێك گوێیان لە عیلم و پەندو ئامۆژگاری و ووتار گرتووە، بەڵام گوێیان پێنەداوەو کاری چاکەیان پێ نەکردووە، بۆیە هەرکەسێك کاری چاکە نەکات بە عیلم و زانیارییەکەی یان ووتەی پێچەوانەی کردەوەی بێت ئەوەیە شایستەی سزای بە ئێش و سەرشۆڕکەر دەبێت لە دواڕۆژدا.

## ١١. دواكەوتن بە بەردەوامی لە ڕیزی یەکەم لە نوێژی جەماعەت:

دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ عَنِ الصَّفِّ الأوَّل حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ)) [٢١٦].

واتە: کەسانێك بەردەوام دوا دەکەون لە ڕیزی یەکەم لە نوێژی جەماعەت، تا خوای پەروەردگاریش دوایان دەخات بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

زانای پایەبەرز ئیمامی السُّبْكي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: پێدەچێت ئەم هەڕەشە توندە بۆ موسڵمانێك بێت ئەوەندە دوا دەکەوێت لە ڕیزی یەکەم لە نوێژی جەماعەت تا وای لێدێت واز لە نوێژ دێنێت، یان ئەو دواکەوتنەی وای لێدەکات نوێژەکانی بەردەوام دوا دوابخات و لە کاتی خۆیدا نەیکات [٢١٧].

وە زانای پایەبەرز مُحَمَّد الحسن الـدَّدو [٢١٨] (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: پێدەچێت ئەو دواکەوتنە لە ڕیزی یەکەم لە نوێژی جەماعەت دواکەوتنێك بێت بێ ئەوەی خاوەنەکەی هیچ عوزرو بیانویەکی شەرعی هەبێت، بەڵکو دونیای خۆش دەوێت و شوێنی کەوتووەو داوێتی بەسەر دوارۆژدا.

---

[٢١٦] رواه أبو داود (٦٧٩)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٧٦٩٩).

[٢١٧] بڕوانە: المنهل العذب المورود شرح سنن الإمام أبي داود لمحمود السبكي (٥/ ٧٠).

[٢١٨] مُحَمَّد الحسن الدَّدو یەکێکە لە زانا ناودارو شارەزاکانی وڵاتی مۆریتانیا.

**١٢. خواردنەوەی مەی:**

هاوەڵی بەڕێز جابر کوڕی عبدالله (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: جارێکیان پیاوێك لە "جَـیشان" (شوێنێکە لە وولاتی یەمەن) هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکرد دەربارەی خواردنەوەیەك کە لە وولاتی ئەوان دەخورێتەوە لە گەنمە شامی دروست دەکرێت و پێی دەووترێت (الِمزْرُ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەو خواردنەوەیە سەرخۆش کەرە؟ پیاوەکە ووتی: بەڵێ، هەرکەسێك بیخواتەوە سەرخۆشی دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، إنَّ عَلَى اللهِ عَهْدًا لِمَنْ يَشْرَبُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ طِينَةِ الْخَبَالِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا طِينَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ أَوْ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ)) [٢١٩].

واتــە: هــەموو خــواردن و خواردنەوەیــەکی سەرخۆشــکەرو بــێ هۆشــکەر حەرامە، وە خوای پەروەردگار پەیمانی داوەو هەڕەشەی کردووە لەو کەسەی کـە مـەی دەخواتــەوە (خــۆی بــێهۆش دەکـات بــە مـاددە بێهۆشــکەرو سڕکەرەکان) کە (طِينَةُ الْخَبَال) بکاتــە خواردنـەوەی ئـەو کەسـە لـە دواڕۆژدا، ووترا: ئەی پێغەمبـەر (ﷺ) (طِينَةُ الْخَبَال) چییە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: کێم زوخاوو خوێن و پیسی ئەهلی ئاگری دۆزەخـە، دەرخـواردی مـەی خـۆرو خۆ بێ هۆشکەرەکان دەدرێت.

---

[٢١٩] رواه الإمام أحمد –الفتح الرباني– (١٣٢/١٧)، ومسلم واللفظ له (٢٠٠٢)، وأبو داود (٣٦٨٠)، والنسائي (٥٧٠٩).

وە هەروەهـــا هـــاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی عَمْرو (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموویت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ وَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، وَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ فَشَرِبَ فَسَكِرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ فَشَرِبَ فَسَكِرَ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ رَدَغَةِ الْخَبَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا رَدَغَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ))[٢٢٠].

واتە: هەرکەسێك مەی خواردەوەو خۆی سەرخۆش کرد، ئەوە چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، وە ئەگەر بەو حاڵەوە بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، بەڵام ئەگەر وازی لێهێناو تەوبەی کرد ئەوە خوای پەروەردگار تەوبەی لێ قەبوڵ دەکات، وە ئەگەر گەڕایەوە سەر ئەو تاوانەو مەی خواردەوەو خۆی بێهۆش کردەوە، ئەوە چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، وە ئەگەر بەو حاڵەوە بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، بەڵام ئەگەر وازی لێهێناو تەوبەی کردەوە، ئەوە خوای پەروەردگار تەوبەی لێ قەبوڵ دەکات، وە ئەگەر ئەمجارەشیان گەڕایەوە سەر ئەو تاوانەو مەی خواردەوەو خۆی بێهۆش کردەوە، چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، وە ئەگەر بەو حاڵەوە بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، بەڵام ئەگەر وازی لێهێناو تەوبەی کردەوە

---

[٢٢٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٣٨/١٧)، والترمذي (١٨٦٢)، وابن ماجه واللفظ له (٣٣٧٧)، والنسائي (٥٦٧٠)، والدارمي (٢٠٩١)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦٣١٢).

خوای پەروەردگار تەوبەی لێ قەبوڵ دەکات، ئەگەر ئەو کەسە هەر وازی نەهێناو گەڕایەوە سەر خواردنەوەیی و خۆی بێهۆش کردەوە، ئەوە خوای پەروەردگار پەیمانی داوەو هەڕەشەی کردووە کە (رَدْغَـــةُ الْخَبَـــال) بکاتە خواردنەوەی ئەو کەسە لە دواڕۆژدا، ووترا: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) (رَدْغَـــةُ الْخَبَال) چییە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کێم زوخاوو خوێن و پیسی ئەهلی ئاگری دۆزەخە، دەرخواردی مەی خۆرو خۆ بێهۆشکەرەکان دەدرێت [*].

ئەی ئەو کەسەی مەیی و هاوشێوە حەرامەکانی دەخۆیتەوەو نوێژخوێنیشی، ئەگەر لەو چل شەوو ڕۆژەی کە نوێژت لێ وەرناگیرێت بمرێت، دەبێ حاڵت چۆن بێت لای خوای پەروەردگار، وە حوکمی دواڕۆژت چی بێت؟ لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) بەو ترسناکییە باسی مەی خواردنەوەی کردووە.

## ١٣. درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ):

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)) [٢٢١].

---

[*] موسڵمانی حۆشەویست تەنها مەی حەرام نییە بەڵکو هەر ماددەیەك مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوە حەرامە وەکو (تلیاك و حەشیشەو ئەفیۆن و ......هتد)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ))، واتە: هەموو شتێك كە مرۆڤ سەرخۆش دەكات و عەقڵی لای خۆی ناهێڵێت حەرامە، وە هەر شتێك خواردنەوەی زۆری مرۆڤ سەرخۆش دەكات ئەوە كەمەكەشی هەر حەرامە ئەگەر دڵۆپەیەكیش بێت، وە بە هیچ شێوەیەك عیلاج و چارەسەر بە هۆكاری حەرام ناكرێت وەكو (مەی و بیرەو ....).

[٢٢١] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٦٧/١٩)، والبخاري (١٢٩١)، ومسلم واللفظ له (٣)، وأبو داود

واته: هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست درۆم بەدەمەوە هەڵبەستێت، ئەوە با شوێنێك لە ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی دابنێت.

موسڵمان ئاگاداربەو باش بزانە ڕەتکردنەوەی فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی کەمتر نییە لە درۆ هەڵبەستن بۆی، پاش ڕوون بوونەوەی صەحیحێتی و دەرکەوتنی مانای تەواوی، چونکە ئەو کەسەی درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەڵدەبەستێت، پێغەمبەری خواو (ﷺ) فەرموودەکانی بەلاوە کەمەو بە چاوی بێڕێزییەوە سەیریان دەکات، وە ئەو کەسەشی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتدەکاتەوە یان بەلایەوە کەمەو بە چاوی بێڕێزییەوە سەیریان دەکات، یان باوەڕی پێی نییە جا بەهەر بیانویەك بێت، چونکە ئەوەی موسڵمانی ڕاستەقینە بێت دەبێت حاڵی بەو شێوەیە بێت کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ (الأحزاب: ٣٦).

واتە: بۆ پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار نییە کاتێك خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمانێکیان کردو شتێکیان بە باش زانی، ئەوان بڵێن: ئێمە سەرپشکین لەوەی کە شوێنی بکەوین یان نا!! نەخێر وانییە بەڵکو دەبێت گوێڕایەڵی تەواویان هەبێت بۆ فەرموودەکانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەوان خۆیان بە ئیماندار دەزانن، وە هەرکەسێك سەرپێچی فەرمانەکانی خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکات، ئەوە بێگومان

---

(٣٦٥١)، والترمذي (٢٦٥٩)، وابن ماجه (٣٠)، والدارمي (٥٩٣).

سەری لێشێواوە بەسەر لێشێوانێکی ڕوون و ئاشکرا.

وە هەروەها دەفەرموویّت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ (الحشر: ٧).

واتە: ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویّتی بۆتان و فەرمانی پێکردوون، ئێوە بیکەن و دەستی پێوە بگرن، وە ئەوەی ئەو ڕێگری لێکردوونە تا نەیکەن و بە خراپی دەزانێت، ئێوە مەیکەن و لێی دوور بکەونەوە، وە لە خوا بترسن و تەقواتان هەبێت و خۆتان لە غەزەب و تووڕەیی خوا بپارێزن (بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی)، چونکە بەڕاستی خوای پەروەردگار تۆڵەو سزای زۆر توند و بە ئێشە.

## ١٤. خواردن و خواردنەوە لە قاپ و قاچاغی ئاڵتون و زیو:

دایکی ئیمانداران أُمُّ سَلَمَة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویّت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، فَإِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارًا مِنْ جَهَنَّمَ)) [٢٢٢].

واتە: هەرکەسێك لە قاپ و قاچاغی ئاڵتون و زیو بخوات یان بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخی ڕاکێشاوە بۆ ناو سکی خۆی.

---

[٢٢٢] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٢٥٣/١٧)، والبخاري (٥٦٣٤)، ومسلم واللفظ له (٢٠٦٥)، وابن ماجه (٣٤١٣).

### ١٥. خواردنی ماڵی هەتیو بە زوڵم و ستەم:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾ (النساء: ١٠).

واتە: ئەو کەسانەی کە بە زوڵم و ستەم و ناهەق ماڵ و سامانی منداڵانی بێباوك و هەتیو دەخۆن، بێگومان ئەو کەسانە تەنها ئاگر دەکەنە ناو سکیانەوە، وە بە زوویی دەکرێنە ناو ئاگرێکی زۆر گەرمی بەگوڕی سوتێنەری دۆزەخەوە.

### ١٦. وەرگرتن و بردنی ماڵی خەڵکی بە سوێندی درۆ:

هاوەڵی بەڕێز أبو أمامة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِه، فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ. فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَإِنْ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ)) [٢٢٣].

واتە: هەرکەسێك ماڵ و هەقی موسڵمانێك وەربگرێت و بیبات بۆ خۆی بە سوێندی درۆ، ئەوە خوای پەروەردگار ئاگری دۆزەخی بۆ ئەو کەسە مسۆگەر کردووەو بەهەشتیشی لەسەر حەرام کردووە، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ئەو ماڵە یان ئەو شتە شتێکی کەمیش بێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئەو شتە بە وێنەی دار سیواکێکیش بێت، (واتە: ئەو ماڵەی

---

[٢٢٣] رواه الإمام مالك (١٤٣٥)، وأحمد "الفتح الرباني" (١٠٣/١٨)، ومسلم (١٣٧)، والنسائي (٥٤١٩)، والدارمي (٢٦٠٣)، وإبن ماجه (٢٣٢٤).

که به سوێندی درۆ وەری دەگرێت با ئەوەندە کەمیش بێت).

## ١٧. کەمتەرخەمی لە گەیاندنی ئەمانەت و بچڕاندنی سیلەی ڕەحم:

پارێزگاری کردن لە ئەمانەت و گەیاندنی سیلەی ڕەحم و پەیوەندی خزمایەتی، گرنگترین ئەو کارانەن کە لە دوارِۆژدا لە تەنیشت پردی (صِراط)ـەوە دەوەستن جگە لە کردەوە چاکەکانی تر، ئەویش لەبەر گەورەییانە لای خوای پەروەردگار، هەروەك هاوەڵی بەڕێز حُذَيفَة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((... فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا (ﷺ) فَيَقُومُ فَيُؤْذَنُ لَهُ، وَتُرْسَلُ الأَمَانَةُ وَالرَّحِمُ، فَتَقُومَانِ جَنَبَتَي الصِّرَاطِ يَمِينًا وَشِمَالاً فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْقِ ...)) [٢٢٤].

واتە: ... پاشان خەڵکی لەو ناخۆشی و ناڕەحەتییەی کە تیایدان دێنە لای پێغەمبەر (ﷺ) تا شەفاعەت بکات بۆ ڕزگار بوونیان، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەستێت بۆ ئەوەی شەفاعەت بکات ڕێگەی پێدەدرێت و ئەویش شەفاعەت دەکات، وە ئەمانەت و سیلەی ڕەحم دەنێردرێن، هەردووکیان لای ڕاست و چەپی پردی (صِراط)ـەوە دەوەستن، یەکەم کۆمەڵتان بە وێنەی خێرایی تیشك دەپەڕنەوە...).

پێدەچێت وەستانی ئەمانەت و سیلەی ڕەحم لای ڕاست و چەپی پردی (صِراط) بۆ ئەوە بێت تا پێی ئەو کەسانە جێگیر بکەن کە بە جوانی و ڕێك و پێکی ئەنجامیان داون، وە ئەو کەسانە بەردەنەوە ناو ئاگری دۆزەخ کە

---

[٢٢٤] رواه الإمام مسلم (١٩٥)، والحاكم (٦٣١/٤).

فەوتاندوویانەو بە ڕیك و پێکی بە جێیان نەگەیاندوون، لە کاتێکدا هاوەڵی بەڕێز جُبَیْرِ کوڕی مُطْعِمْ (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ)) [225].

واتە: ئەو کەسەی کە سیلەی ڕەحم و پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت بە بێ هیچ بیانویەکی شەرعی ناچێتە بەهەشتەوە.

زانای پایەبەرز ئیمامی الُملا عَلي قاري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ئیمامی التُّوربشتي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (جَنَبَتَيِ الصِّرَاطِ): مەبەست پێی لای ڕاست و چەپی پردی (صِراط)ـە، واتای فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێت: کە ئەمانەت و سیلەی ڕەحم ئەوەندە گەورەو گرنگن بەلای خوای پەروەردگارەوە کە پێویستە بەندەکان ڕەچاویان بکەن و بە چاکی جێبەجێیان بکەن، دەکرێن بە شێوەی دوو مرۆڤ لەبەر چاوی کەسانی دەست پاك و خیانەتکار، وە لەبەر چاوی ئەو کەسەی کە سیلەی ڕەحمی گەیاندووەو ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندووەو نەیگەیاندووە، تا ببنە بەڵگەی ڕزگار بوون بۆ ئەو کەسانەی کە بە جوانی و ڕێك و پێکی ئەنجامیان داون و گەیاندوویانە، وە ببنە بەڵگەی لەناو چوون و بەربوونەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەی کە فەوتاندوویانەو بە ڕیك و پێکی بە جێیان نەگەیاندوون، تا هەردوو لایان لەیەك جیا بکرێنەوە [226].

وە زانای پایەبەرز ئیمامی الطِّيبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: ناردنی

---

[225] رواه الإمام أحمد "المسند" (١٦٢٩١)، والبخاري (٥٩٨٤)، ومسلم واللفظ له (٢٥٥٦)، والترمذي (١٩٠٩)، وأبو داود (١٦٩٦).

[226] بڕوانە: مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح للملا علي قاري (٥٢٧/٩).

ئەمانـەت و سـیلەی ڕەحـم لەبـەر گـەورەیی و پلـەو پایەیانـە لای خـوای پەروەردگار، لە دواڕۆژدا دەکرێنە سەر شێوەی دوو مرۆڤ بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار ویستی لێیە، وە مانـای فەرموودەکـە ئەوەیـە: ئەمانـەت و سیلەی ڕەحم لە تەنیشتی لای ڕاست و چەپی پردی (صِراط)ـەوە دەوەسـتن تا داوای ماف خۆیـان بکـەن لـەو موسـڵمانانەی کـە دەیانـەوێت بەسـەر پـردی (صِراط)دا بپەڕنـەوە، ئەگـەر بـە جوانی و ڕێـك و پێکـی ئـەنجامیان دابن و گەیاندبێتیان یارمەتیان دەدەن بۆ پەڕینـەوەیان بەسـەر پـردی (صِــراط)دا بەسـەلامەتی، بـەڵام ئەگـەر فەوتانـدبوویان و بـە ڕیـك و پێکـی بـە جێیـان نەگەیانـدبوون، وازی لێـدێنن و یارمـەتی نـادەن تـا بـەر ببێتـەوە نـاو ئـاگری دۆزەخ [٢٢٧].

هاوەڵی بەڕێز إبنُ مَسعود (خوای لیّ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ((القَتْلُ فِي سَبيلِ اللهِ يُكَفِّرُ الذُنوبَ كُلَّها إلاّ الأمانَةَ، قالَ: يُؤتَى العَبدُ يَومَ القيامَةِ وَإنْ قُتلَ فِي سَبيلِ اللهِ، فَيُقالُ: أدِّ أمانَتَكَ، فَيَقُولُ: أيْ رَبِّ كَيفَ وَقَد ذَهَبَت الدُّنيا؟ فَيُقالُ: إنْطَلِقُوا بِهِ إلى الهاوِيَة، فَيُنْطَلَقُ بِهِ إلى الهاوِيَة، وَتُمَثَّلُ لَهُ أَمانَتُه كَهَيئَتِها يَومَ دُفِعتْ إليه، فَيَراها فَيَعْرِفُها، فَيَهوي فِي أَثَرِها حَتَّى يُدْرِكَها، فَيَحْمِلُها عَلى مَنكِبَيه، حَتَّى إذا ظَنَّ أنَّهُ خارِجٌ، زَلَّتْ عَن مَنكِبَيهِ، فَهو يَهوي فِي أَثَرِها أَبَدَ الآبدينَ، ثُمَّ قالَ: الصَّلاةُ أمانَةٌ، وَالوُضوءُ أمانَةٌ، وَالوَزنُ أمانَةٌ، وَالكَيلُ أمانَةٌ، وَأشياءَ عَدَّدَها، وَأَشَدُّ ذلكَ الوَدائعَ، قالَ: يَعني زاذانُ: فَأَتَيتُ البَرّاءَ بنَ عازِبَ فَقُلْتُ: ألاَ تَرى إلى ما قالَ إبنُ مَسعود قالَ: كَذا؟ قالَ: صَدَقَ، أما سَمِعْتَ اللهَ يَقولُ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ

---

[٢٢٧] بڕوانە: شرح الطيبي على مشكاة المصابيح المسمى: الكاشف عن حقائق السنن (١٠/٢٣١).

يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ (النساء: ٥٨) [٢٢٨].

واتــه: شــههيد بــوون لــه پێنــاو خــوای پــهروهردگاردا هــهموو تاوانێـك دهسرِێتهوه جگه له ئهمانهت، إبنُ مَسعود (خوای لێ ڕازی بێت) فـهرمووی: لـه ڕۆژی قیامهتـدا بهندهیـهك دههێنـدرێت ئهگـهر شـههیدیش بووبێـت لـه پێنـاو خوای پهروهردگاردا، پێی دهووترێت: ئهو ئهمانهتانهی لات بووه بیـانگێڕهوه بۆ خاوهنهكانیان، ئـهویش دهڵێـت: ئـهی پـهروهردگار ئهمانـهتی چـی؟ چـۆن بیانگێڕمـهوه لـه كاتێكدا دونیـا نـهماوه (لـه دونیـادا نـیم و ئهمانهتـهكانم لا نهماوه)؟ دهووترێت: بیبهن فڕێی بدهنه ناو ئاگری دۆزهخهوه، ئـهو بهندهیـه دهبردرێت و فڕێی دهدرێته ناو دۆزهخهوه، ئهو شتهی له دونیادا به ئهمانـهت پێـی درابـوو تـا پارێزگـاری لێبكـات، بـهڵام ئـهو خیانـهتی تیـا كردبـوو و فهوتاندبووی، ئهو ئهمانهته دێتهوه سهر ئهو شـێوهیهی كه لـه دونیـادا پێـی درابوو، ئهو بهندهیه سهیری دهكات و دهیناسـێتهوهو شـوێنی دهكـهوێت تـا دهگات پێی، ههڵی دهگرێت و دهیكاتـه سـهر شانی، ئـهو بهندهیـه وا گومـان دهبات ئێستا دهچێت دهیهێنێت و دهیداتهوه خاوهنهكهیی و ڕزگاری دهبێت، بهڵام له ناكاو پێیهكانی دهخلیسكێت و بهردهبێتهوه لهسـهر شـانی، ئـهویش به شـوێنیا دهڕوات هـهتا ههتایـه (بـهرهو خـوارهوهی دۆزهخ بهردهبێتـهوه)، پاشان إبنُ مَـسعود (خـوای لـێ ڕازی بێـت) فـهرمووی: نوێـژ ئهمانهتـه (خـوای

---

[٢٢٨] رواه الطبراني في "الكبير" (١٠٥٢٧)، وأبو نعيم في الحلية (٤/١٠١)، وحسنه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٢٩٩٥).

پەروەردگار خستوویەتییە سەر شانت پێویستە پارێزگاری لێبکەیت)، وە دەست نوێژ ئەمانەتە (پێویستە بە جوانی بیگریت و کەم و کوڕی تیا نەکەیت)، وە کێشانەو پێوانە ئەمانەتە (بە باشی بیپێوی بێکەم و زیاد)، چەند شتێکی باس کرد کە هەموویان ئەمانەتن و پێویستە بپارێزرێن و خیانەتیان تیا نەکرێت، لە هەموویان گەورەتر ئەو شتانەیە کە مافی خەڵکییەو لەژێر دەستتدایە، زاذان (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: چووم بۆلای بَرّاء کوڕی عازب (خوای لێ ڕازی بێت) پێم ووت: ئایا نابینیت إبــنُ مَــسعود (خوای لێ ڕازی بێت) چی دەڵێت؟ ئەویش ووتی: ڕاست دەکات، ئایا گوێت لە فەرمودەی خوای پەروەردگار نەبووە کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾؟(النساء: ٥٨).

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار فەرمانتان پێدەکات کە هەموو ئەمانەت و سپاردەیەك بدەنەوە دەست خاوەنەکەی، وە هەر کاتێك دادگایی نێوان خەڵکی دەکەن بە دادپەروەرانەو یەکسانییەوە بیکەن، بەلای هیچ کەسێکدا دایمەبڕن، بەڕاستی خوای گەورە بە جوانترین شێوەو بە شێوازێکی زۆر چاك ئامۆژگاریتان دەکات، بێگومان خوای پەروەردگار بیسەرە بۆ هەموو ووتەیەك، وە بینایە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك، دەی کەوابوو ئێوە ئەو ئەمانەتانەی لاتانە بیدەنەوە خاوەنەکانیان.

زۆر بەداخەوە کاتێك سەیری حاڵی ئەمڕۆی خەڵکی دەکەیت بە ئاشکرا دەبینرێت خیانەت دەکرێت لە ئەمانەت و سپاردەکانی سەر شانیان، خیانەت

کردن له عیبادەتدا (ئەنجامدانی بە کەم و کورپییەکی زۆرەوە)، خیانەت کردن له بەخێو کردن و چاودێری کردنی منداڵ و کەس و کاریان، وە خیانەت کردن له کارو پیشەکانیان ئەویش بە درۆ کردن و فێڵ کردن و ڕاستگۆ نەبوون تیایاندا، وە پەیوەست نەبوون بە کاتی دیاری کراوی کارو پیشەیان،... هتد، ئەمانەو چەندین شتی تر کە هەموویان ئەمانەتن و پێویستە موسڵمان ئاگای لێیان بێت و خیانەتیان تیا نەکات، بەڵکو بە ڕێکو پێکی و بە باشی ئەنجامیان بدات.

### ١٨. درۆ هەڵبەستن بۆ موسڵمان:

هاوەڵی بەڕێز عَبدُالله کوڕی ئیمامی عُمَر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ حَالَتْ شَفَاعَتُهُ دُونَ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ فَقَدْ ضَادَّ اللَّهَ فِي أَمْرِهِ، وَمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَلَيْسَ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ، وَلَكِن بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، وَمَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهُوَ يَعْلَمُه، لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَنْزِعَ، وَمَنْ قَالَ فِي مُؤْمِنٍ مَا لَيْسَ فِيهِ أسكَنَهُ اللهُ رَدْغَةَ الْخَبَالِ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ وَلَيسَ بِخارِجٍ))[٢٢٩].

واتە: هەرکەسێك تکا بۆ کەسێك بکات کە ئەو کەسە حەددێکی شەرعی کەوتۆتە سەر بۆ ئەوەی لایبەرێت و جێبەجێ نەکرێت لەسەری، ئەوە ئەو کەسە دژایەتی خوای پەروەردگاری کردووە لە فەرمانیدا (واتە: خوای

---

[٢٢٩] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٥/٢٨٨)، وأبو داود (٣٥٩٧)، والحاكم (٢/٣٢)، وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (٦١٦٩).

پەروەردگار فەرمانی کردووە تا حوکمی بەسەردا جێبەجێ بکرێت، بەڵام ئەو کەسە تکاو واستەی بۆ دەکات تا ئەو حەددەی لەسەر لابەرێت)، وە هەرکەسێك بمرێت و قەرزی خەڵکی لەسەر بێت، ئەوە ئەو قەرزوماڵەی خەڵکەی لێدەسەندرێتەوە لە ڕۆژێکدا کە دینارو درهەمی لێناسەندرێتەوە (ئەگەر ئەو موسڵمانە بە نییەتی خواردن و نەدانەوەی قەرزی وەرگرتبێت)، بەڵکو چاکەو خراپەیە (لە چاکەکانی دەبردرێت و دەدرێتە خاوەن قەرزەکانی، وە لە خراپەی ئەوان دێتە سەر خراپەکانی)، وە هەر کەسێك موجادەلەو دەمەدەمێ بکات لەسەر شتێکی ناهەق و باتڵ و بشزانێت ئەو شتە ناهەقە، ئەوە بەردەوام ئەو کەسە لە ژێر غەزەب و تووڕەیی خوای پەروەردگاردایە، وە هەر کەسێك شتێك بداتە پاڵ موسڵمانێك کە ئەو شتە لەو موسڵمانەدا نییە (درۆی بۆ هەڵبەستێت)، ئەوە خوای پەروەردگار دەیخاتە ناو کێم زوخاو و پیسی ئەهلی ئاگری دۆزەخەوە، تا واز دێنێت لەو درۆیەی کە بۆی هەڵبەستووە، یان لێی دەردەچێت، کە لێشی دەرناچێت بە ئاسانی (واتە: تا گەردنی خۆی بەو موسڵمانەی کە درۆی بۆ هەڵبەستووە ئازاد نەکات، یان بە پێی ئەو تاوانەی کە کردوویەتی تا نەسووتێت پاك نابێتەوەو دەرناچێت لە ئاگری دۆزەخ).

## ١٩. قسە نەکردن لەگەڵ موسڵمان زیاتر لە سێ ڕۆژ:

هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ فَمَنْ هَجَرَ فَوْقَ ثَلاَثٍ

فَمَاتَ دَخَلَ النَّارَ)) [٢٣٠].

واتـه: حـەڵاڵ نییـەو دروسـت نییـە بـۆ هـیچ موسـڵمانێك كـە قـسە لـە بـرا موسڵمانەكەی دابڕێت و قسەی لەگەڵدا نەكات زیاتر لە سێ ڕۆژ، هەر كەسێك لە سێ ڕۆژ زیاتر قسە لە برا موسڵمانەكەی دابڕێـت و قـسەی لەگەڵدا نـەكات (بێ هیچ بیانوویەكی شەرعی)، ئەو كەسە بمرێت دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە.

**٢٠. هەركەسێك حەز بكات خەڵكی لەبەری هەستن و بە گەورەی بزانن:**

أبو مجلز (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: جارێكیان مُعاویـة (خوای لێ ڕازی بێت) دەرچوو، چوو بۆلای إبنُ الزُّبیر و إبنُ عامر (خوایان لێ ڕازی بێت)، إبنُ عامر لەبەری هەستا، بەڵام إبنُ الزُّبیر لەبـەری هەڵنەستا، مُعاویـة (خوای لێ ڕازی بێت) بە إبنُ عامرِ ووت: دانیشە، چونكە گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە، فەرموویـەتی: ((مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَـدَهُ مِـنَ النَّارِ)) [٢٣١].

واتە: هەر كەسێك حەز بكات و پێی خۆش بێت پیاوان لەبەری هەستن و بە گەورەی بزانن، ئەوە با شوێنێك لە ئاگری دۆزەخدا بۆ خۆی دابنێت.

زانای پایەبەرز إبنُ حَجَر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە ئیمامی "غَزالـي"ـەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: ئەگەر ئـەو هەسـتانە بـۆ بەگـەورە زانـین

---

[٢٣٠] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٣٩)، والبخاري (٦٠٧٧)، ومسلم (٢٥٦١)، وأبو داود واللفظ له (٤٩١٤)، والترمذي (١٩٣٢)، وإبن ماجه (٤٦).

[٢٣١] رواه الإمام مالك (١٧١٧)، وأحمد "الفتح الرباني" (٢٢/٣٥٧)، والبخاري (٥٦٣٤)، ومسلم واللفظ له (٢٠٦٥)، وابن ماجه (٣٤١٣)، والدارمي (٢١٢٩).

بێت ئەوە مەکروهەو تاوانە، بەڵام ئەگەر بۆ ڕێز لێگرتن بێت ئـە وە دروسـتە (وەکو هەستان لەبەر میوان یان کەسێك ماوەیەکە نەتبینیوە). [٢٣٢]

## ٢١. کەسێك بانگەشەی شتێك بکات و هی خۆشی نەبێت:

هاوەڵی بەڕێز أَبو ذَر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إِلاَّ كَفَرَ، وَمَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ دَعَا رَجُلاً بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلاَّ حَارَ عَلَيْهِ)) [٢٣٣].

واتە: هیچ پیاوێك نییە بڵێت من لە باوکی خـۆم نـیم، بشزانێتت کـە کـوڕی باوکی خۆیەتی، ئیللا کوفری کردووە، وە هەر کەسێك بڵێت ئەو شتە هی منە کە هی ئەویش نییە، ئەوە ئەو کەسە لە ئێمە نییە، وە با شـوێنێك لـە ئـاگری دۆزەخدا بۆ خۆی دابنێت، وە هـەر کەسـێك بـە موسـڵمانێك بڵێـت: کـافر یان دوژمنی خوا، واش نەبێت (واتە: ئەو موسـڵمانە کـارێکی وای نـەکردبێت پێـی کـافر بێـت یـان ببێتـە دوژمنـی خـوا)، ئـەوە ئـەو قـسەیەی بەسـەر خۆیـدا دەگەڕێتەوە (ووتنی: کافر یان دوژمنی خوا).

زانـای پایەبـەرز ئیمـامی النَّـووَي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) دەڵێـت: ئـەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی بانگەشەکردنی هەرشتێك کە هی خۆت

---

[٢٣٢] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري لإبن حجر العسقلاني (٥٦/١١ ح ٦٢٦٢).

[٢٣٣] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (٤٢/١٧)، ومسلم واللفظ له (٦١)، وإبن ماجه (٢٣١٩).

نەبێت، جا مافی خەڵکی بێت یان نا، (واتە: ئەگەر ئەو شتە مافی کەسێکی دیاری کراویش نەبوو، هەر حەرامە بڵێیت: هی منە، چونکە لە بنەڕەتدا مافی تۆ نییە)، وە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حەرامە ماڵێك یان شتێك وەربگریت کە هی تۆ نییەو شایستەی تۆ نییە، با حاکم یان قازیش بۆت دابنێت یان بۆت وەربگرێت [٢٣٤].

## ٢٢. داوا کردنی ماڵ و پارە لە خەڵکی بۆ زیاتر دەوڵەمەند بوون:

هاوەڵی بەڕێز ئیمامی عُمَرِ کوڕی خَطّاب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ سَأَلَ النَّاسَ لِيُثْرِيَ مَالَهُ فَإِنَّما هيَ رَضْفٌ مِنَ النَّارِ مُلْهِبَة، فَمَنْ شاءَ فَلْيُقِلَّ، وَمَنْ شاءَ فَلْيُكْثِرْ)) [٢٣٥].

واتە: هەر کەسێك داوای پارەو ماڵ لە خەڵکی بکات (دەستیان لێ پان بکاتەوە) بۆ ئەوەی ماڵەکەی زیاتر بکات و خۆی دەوڵەمەندتر بکات، ئەوە ئەو دەست پان کردنەوە و سواڵ کردنەی (یان ئەو ماڵەی کە وەری دەگرێت)، بەردی گەرمی داخکراوی ناو ئاگری دۆزەخە وەری دەگرێت و دەیخوات لە دۆزەخدا، جا هەر کەسێك حەزی لێیە با کەم داوا بکات، یان زۆر (واتە: بە سواڵ کردن و دەست پان کردنەوەی لە خەڵکی بۆ زیاتر دەوڵەمەند بوون، لە کاتێکدا خۆی هەیەتی و هەژار نییە، یان قەرزێکی زۆر نەکەوتۆتە سەری، ئەوە ئەو کەسە دەوڵەمەندە چەندێ زۆر ماڵ وەربگرێت ئەوەندە لە

---

[٢٣٤] بڕوانە: صحيح مسلم بشرح النووي (٢/١٠ ٤١ ح ٦١).

[٢٣٥] رواه إبن حبان (٣٣٩١)، وقال الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب": صحيح لغيره (٨٠٦).

ئاگری دۆزەخی بۆ خۆی زیاد کردووە، وە ئەگەر کەمتر وەربگرێت، ئەوە کەمتر ئاگری دۆزەخی وەرگرتووە).

## ٢٢. کوشتنی مرۆڤ بە ناهەق:

هاوەڵی بەڕێز أبو هُرَيرَة (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنْ النَّارِ)) [٢٣٦].

واتە: ئەی موسڵمانان هیچ کەسێك لە ئێوە با ڕووی چەکەکەی (شمشێرەکەی یان ڕمەکەی) نەکاتە برا موسڵمانەکەی، چونکە نازانێت پێدەچێت شەیتان لە دەستی وەربگرێت و بیکوژێت (بە یاری و گاڵتەوە)، ئەو کاتە ئەو کەسەی ڕووی سیلاحەکەی کردۆتە برای موسڵمانی دەکەوێتە ناو چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخەوە (واتە: دوای کوشتنی برا موسڵمانەکەی، هەر بۆیە چەك و سیلاح ڕووکردنە موسڵمان بە یاری و گاڵتەوە، فریشتەکانی خوای پەروەردگار نەفرەتت لێدەکەن هەر چەندە ئەو موسڵمانە برای دایك و باوکیشت بێت).

---

[٢٣٦] رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني"(١٩/٣٣٠)، والبخاري واللفظ له (٧٠٧٢)، ومسلم (٢٦١٧).

## سێیەم:
## لەو تاوانانەی کە بە هۆیەوە خاوەنەکەی دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە

**بەکەم زانینی تاوانە بچوکەکان و سەیرکردنی بە چاوی سووکەوە:**

زۆر بەداخەوە زۆربەی موسڵمانانی ئەم ڕۆژگارە تاوانە بچوکەکان بەکەم دەزانن و بە چاوی سووکەوە سەیری دەکەن و دەڵێن: ئەو تاوانانە نوێژو ڕۆژوو و چەند کارێکی تری چاکە دەیان سڕێتەوە، کێشە تەنها ئەوە نییە کە موسڵمان دەکەوێتە ناو تاوانە بچوکەکانەوەو بەس، بەڵکو کێشە بەکەم زانینی و سەیرکردنێتی بە چاوی سووکەوە، وە کەمتەرخەم بوون تیایدا، وە سوور بوون و بەردەوام بوون لەسەری، پاشان تەوبە نەکردن لێی ! !.

هاوەڵی بەڕێز عَبداللە کوڕی مَسْعُود (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، فَإِنَّهُنَّ يَجْتَمِعْنَ عَلَى الرَّجُلِ حَتَّى يُهْلِكْنَهُ)) [٢٣٧].

واتە: موسڵمانان خۆتان بپارێزن لە تاوانە بچوکەکان و مەیان کەن، چونکە پیاوی وا هەیە ئەوەندە تاوانی بچوك دەکات تا لەسەری کۆ دەبێتەوەو شانی قورس دەکات و لەناوی دەبات.

وە هاوەڵی بەڕێز سَهلِ کوڕی سَعْد (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، فَإِنَّمَا مَثَلُ مُحَقَّرَاتِ

---

(٢٣٧) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٠/٢١٢) و(١٩/٢٥٣)، والطبراني في الكبير (١٠٥٠٠)، وحسنه الألباني في "صحيح الجامع" (٢٦٨٧).

الذُّنُوبِ كَمَثَلِ قَوْمٍ نَزَلُوا بَطْنَ وَادٍ، فَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، وَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، حَتَّى حَمَلُوا مَا أَنْضَجُوا بِهِ خُبْزَهُمْ، وَإِنَّ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ مَتَى يُؤْخَذْ بِها صَاحِبُهَا تُهْلِكْــهُ)) (٢٣٨).

واته: موسلّمانان خۆتان بپارێزن له تاوانه بچووكه‌كان و مه‌یان كه‌ن، چونكه كردنی تاوانه بچوكه‌كان، نموونه‌ی وه‌كو قه‌ومێك وایه بچن بۆ سه‌فه‌رێك و دابه‌زنه ناو شیوێكه‌وه، هه‌ر یه‌كێك به‌لایه‌كدا بڕوات بۆ كۆ كردنه‌وه‌ی چیلكه‌و دار، یه‌كێك دارێك بێنێت، ئه‌وی تر دارێك بێنێت، تا ئه‌وه‌نده كۆده‌كه‌نه‌وه خواردنه‌كه‌یانی پێ لێده‌نێن (تاوانه بچوكه‌كانیش به وێنه‌ی ئه‌وه كۆ ده‌بێته‌وه تا زۆر ده‌بێت)، وه ئه‌و تاوانانه‌ی كه خه‌ڵكی به بچوكی ده‌زانن و به چاوی سووكه‌وه سه‌یری ده‌كه‌ن هه‌ر كاتێك موسڵمان گوێی پێنه‌داو زۆری كرد له ناوی ده‌بات.

دایكی ئیمانداران خاتوو عائیشة (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رموێت: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) پێی فه‌رمووم: ((يَا عَائِشَةُ إِيَّاكِ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ فَإِنَّ لَهَا مِنْ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ طَالِبًا)) (٢٣٩).

واته: ئه‌ی عائیشة ئاگاداربه‌و خۆت بپارێزه له‌و تاوانانه‌ی كه خه‌ڵكی به بچوكی ده‌زانن و به چاوی سووكه‌وه سه‌یری ده‌كه‌ن، چونكه خوای په‌روه‌ردگار لێپرسینه‌وه‌یان له‌سه‌ر ده‌كات.

---

(٢٣٨) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٥٣)، والبيهقي في شعب الإيمان (٧٢٦٧)، وصححه السّيوطي في "الجامع الصغير" (٢٩١٦)، والألباني في "صحيح الجامع" (٢٦٨٦).

(٢٣٩) رواه الإمام أحمد "الفتح الرباني" (١٩/٢٥٣)، وابن ماجه (٤٢٤٣)، والدارمي (٢٧٢٦)، وصححه الألباني في "صحيح الترغيب والترهيب" (٢٤٧٢).

زانای پایەبەرز ئیمامی السِّندي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: (مُحَقَّــرَاتُ الذُّنُوبِ): ئەو تاوانەن کە خەڵکی گوێی پێنادەن و بە کەمی دەزانن، (طَالِباً): واتــە: خــوای پــەروەردگار لێپرســینەوەیان لەســەر دەکــات، بــەلای خــوای پەروەردگارەوە گەورەیە هــەر بۆیــە فــەرمانی کــردووە تــا بنووســرێت لەســەر ئینسان، وە فریشتەشی تایبەت کردووە بە نووسینی[240].

وە زانای پایەبەرز ئیمامی غَزالِي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) شــەش خــاڵی بــاس کردووە بۆ ئەوەی ئەو تاوانانەی کــە بــچوکن و خــەڵکی گــوێی پێنــادەن و بــە کەمی دەزانن ببێت بە تــاوانی گــەورە: یــەکێك لــەو هۆکارانــە ئەوەیــە: کاتێــك موسڵمانێك تــاوان دەکــات بــە کــەمی دزانێــت و بــە چــاوی ســووکەوە ســەیری دەکات ئەوکاتە تاوانە بچوکەکانی دەبێت بە تاوانی گــەورە، چــونکە بەنــدەی موسڵمان هەرچەندێك تاوان بە گەورە بزانێت و بە دڵی پڕ لە ترسەوە ســەیری بکات و ئەنجامی بدات، ئەوە لای خوای پەروەردگار ئەو تاوانە بــچوك دەبێــت (لە بنەڕەتدا تاوانەکە خۆی بچوکە ئەم موسڵمانە کاتێك دڵی دەترسێت و بــە کــەمی نازانێــت، بــەڵکو مرۆڤێکــەو تــاوانی لێوەشــاوەتەوە وەکــو ســەرجەم مرۆڤەکان)[241].

هــەر بۆیــە بِلالِ کــوڕی سَــعْد (ڕەحمــەتی خــوای لێبێــت) دەمــان ترســێنێت و ئاگادارمان دەکاتەوە لە بەکەم زانینی تاوان و گویٚ پێنەدانی و ســەیر کردنــی بە چاوە ســووکەوە، هــەروەك دەڵێــت: ئــەی موســڵمان کاتێــك ویســتت تــاوان

---

[240] بڕوانە: شرح سنن ابن ماجه القزويني للإمام أبي الحسن الحنفي المعروف بالسندي (٢/٥٦٠).

[241] بڕوانە: إحياء علوم الدين للإمام الغزالي بتصرف (٥/٣١).

بکەیت مەلێ تاوانێکی بچوکە، سەیری بچوکی و کەمی تاوانەکە مەکە، بەڵکو سەیری گەورەیی ئەو خوایە بکە کە سەرپێچی دەکەیت [٢٤٢].

موسڵمانی خۆشەویست ئاگاداربەو خۆت بپارێزە لە بەکەم زانین و سوور بوون لەسەر کردنی تاوانە بچوکەکان هەرچەندە کەمیش بێت و بچوکیش بێت، چونکە پێدەچێت ببێتە هۆکارێك لەو هۆکارانەی کە بەندەی موسڵمانی پێ بەردەبێتەوە لەسەر پردی (صِراط)ـەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان بپارێزێت لە ناخۆشی و ناڕەحەتی سەر پردی (صِراط) و سزای ئاگری دۆزەخ، آمیـــــن.

---

[٢٤٢] بڕوانە: شعب الإيمان للبيهقي (٥/٤٣٠)، ئەمە وتەی (بِلالِ کوڕی سَعْد)ـە، نەك فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ).

# كــۆتــــايى

موسڵمانی خۆشەویست پێویستە گرنگی بدرێت بەو کارانەی کە پەیوەستن بە عیلم و زانستی دوارۆژ، وە ئەو کـارە نـاخۆش و ناڕەحەتانـەی ڕووبـەڕووی موسڵمان دەبێتـەوە لـە دوارۆژدا، وە بـاس کـردن و بڵاوکردنـەوەی لـە نێـوان خەڵکیدا، جا بـە هـۆی هۆکـارە جیاوازەکـانی ڕاگەیانـدن بێـت، یان بـە بـاس کردنی بێت لە مزگەوتەکان، تا خەڵکی لە خەوی بێئاگاییان بەخەربێنەوە، وە فریای خۆیان بکەون و کاری چاکە بکەن و دەست لە تاوان و خراپە بگرنـەوە پێش مردنیان.

تێپەڕبوون بەسەر پردی (صراط)، ئەو پردەی کـە لەسـەر دۆزەخ دانـراوە، یەکێکـە لـە ترسـناکترین ناخۆشـی و ناڕەحەتییـەکانی ڕۆژی دوایـی، وە ئـەو قولاپانەی کە لەسەرێتی یـان لاشـەی موسـڵمانانی تاوانبـار برینـدار دەکـات و دەیڕوشێنێت، یان لاشەیان پارچە پارچە دەکات، یان ڕایان دەکێشێت بۆ ناو ئاگری دۆزەخ بە پێی کردەوەکانیان.

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبـە ئـەوەت بـۆ دەرکـەوت، یەکـەم ئوممـەت لـەناو هەموو ئوممـەتان ئوممـەتی پێغەمبـەرە (ﷺ) کـە بەسـەر پـردی (صِـــراط)دا دەپەڕنەوە ئەویش لەبەر ڕیزو کەرامەتیانە لای خوای پەروەردگار، وە یەکـەم کەس لەم ئوممەتە پێغەمبەرە (ﷺ) کە بەسەر پردی (صِراط)دا دەپەڕێتەوە، لــە دوای پێغەمبــەر (ﷺ) هــەژارە کۆچـکردووەکانن، وە کۆتـا کــەس کــە دەپەڕێتــەوە بەســـەر پـــردی (صِـــــــراط)دا، موســـڵمانێکە دەکـــەوێت و هەڵدەستێتەوەو بە سکە خشکێ دەڕوات ئەویش لەبـەر زۆری تـاوان و کـەمی کردەوەی چاکەیەتی.

وه گرنگترین هۆکارو یارمەتیدەر بۆ پێ جێگیر بوون لەسەر پردی (صِراط)و پەڕینەوە بەسەریدا بە ئاسانی و بێ ئەوەی گەرمی ئاگری دۆزەخ بتسووتێنێت و بێ ئەوەی بەربیتەوە ناوی ئەمانەن:

نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار بە کردنی هەموو ووتەو کارێکی چاکە کە خوای پەروەردگار پێی خۆشەو پێی ڕازییە، بە تایبەتی ئەو کارە چاکانەی لەم کتێبەدا باس کراوە، وە دوور کەوتنەوە لە هەموو ووتەو کارێکی خراپ و تاوان کە خوای پەروەردگار پێی ناخۆشەو پێی ڕازی نییە، لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووە حەرامەکان، کردنی تاوانە گەورەکان، کە هەڕەشەی ئاگر یان لەعنەت یان تورەیی خوای پەروەردگار یان سزای توندو بە ئێش بۆ خاوەنەکەی دانراوە.

موسڵمانی خۆشەویست تاکە ڕێگە بۆ ڕزگار بونمان لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط) زۆر کردنی کارە چاکەکانە بە گشتی، وە کردنی ئەو کارانەی ڕزگارکەرن لە ئاگری دۆزەخ، وە ئەو کارانەی کە ڕۆیشتنی موسڵمان خێرا دەکات بەسەر پردی (صِراط)دا، وە کردنی ئەو کارە چاکانەی ڕۆشنکەرەوەی تاریکی سەر پردی (صِراط)ن بە تایبەتی، وە پەلە کردن لە داوای لێخۆش بوون کردن لە خوای پەروەردگار بۆ هەر تاوانێك کە کردوومانە بە تایبەتی تاوانە گەورەکان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾ (النساء: ٣١).

واتە: موسڵمانان ئەگەر ئێوە خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی کە

ڕێگریمان لێکردووه تا نەیان کەن، ئەوه تاوانەکانتان دەسڕینەوەو لێتان خۆش دەبین (تاوانه بچوکەکان)، وه دەتان خەینه ناو بەهەشتانی به قەدرو ڕێزەوه (واته: بەهەشتتان دەدەینێ).

بەڵام هەرکەسێك کەمتەرخەم بێت لەمەدا، سەرقاڵ بوون به ژیانی دونیای بێ ئاگای کردبێت له ژیانی دواڕۆژی و کاره چاکەکانی به باشی ئەنجام نەدابێت، ئەوه لەسەره مەرگ و دوای مردن حەسرەت و پەشیمانی دەردەبڕێت، بەڵام چی کاتێك؟ ئەو کاتەی که دەردەبڕینی پەشیمانی سوودی نییه، ئەو کاتەی که تەواو بەنده ناڕەحەت بووەو ناخۆشی و ناڕەحەتی تەنگی پێهەڵچنیوه.

پیاوچاکانی پێشینی ئەم ئوممەته دەژیان و بەردەوام ترس و دڵەڕاوکێی پەڕینەوەی پردی (صِراط)یان له دڵدا بووه، له هەموو هەڵس و کەوتێکیاندا له پێش چاویان بووه، هەربۆیه دەروونیان پاك بوو له تاوان، وه تاوانیان کەم بوو، چاکەیان زۆر بوو، ئایا ئێمەی موسڵمان وەکو ئەوانین و شوێنیان کەووتوین به ڕاستی؟!!!

سەیری حاڵی رَبیعِ کوڕی خُثَیم بکه (ڕەحمەتی خوای لێبێت) چۆن بەردەوام دڵی لای ناخۆشی و ناڕەحەتی پردی (صِراط) بووه، جارێکیان پیاوێك جوێنی پێدا، ڕەبیعیش ووتی: ئەی فلان کەس خوای پەروەردگار ووتەکەتی بیست (جوێندانەکەت)، بەڵام من وەڵامت نادەمەوەو هیچت پێناڵێم، چونکه پێش چوونه بەهەشتەوه کۆسپێکی زۆر ناخۆش و ناڕەحەت هەیه پردی (صِراط)، ئەگەر به سەلامەتی و به ئاسانی بیبڕم و بەسەریدا بپەڕمەوه ئەوه جوێنەکەی تۆ هیچ زیانێکم پیناگەیەنێت، وه ئەگەر نەتوانم به سەلامەتی

بەسەریدا بپەڕمەوە ئەوە من زۆر خراپترم لەوەی کە پێم دەڵێیت [٢٤٣].

وە با حاڵت وەکو حاڵی هاوەڵی بەڕێز أبو الدّرداء بێت (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: کاتێك بیستم لە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی: لە پێشتانەوە کۆسپێکی زۆر ناخۆش و نارەحەت هەیە "واتە: پردی صِراط" کەسانی لەش قورس ناتوانن بە ئاسانی بیبڕن (شانیان قورس بووە بە تاوان)، بۆیە حەزدەکەم خۆم سووك بکەم (واتە: چاکە زۆر بکەم و تاوان نەکەم) بۆ ڕزگار بوون لەو کۆسپ و ناخۆشی و نارەحەتییە (واتە: کۆسپەکانی سەر پردی (صِراط) [٢٤٤].

با حاڵت وەکو حاڵی خالِدُ الوَرّاق نەبێت (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە کاتێکدا نەزانە بەرامبەر ناخۆشی و نارەحەتییەکانی سەر پردی (صِراط) و بێئاگایە لێی، هەروەك خۆی باسی خۆی دەکات و دەڵێت: جارییەیەکم هەبوو عیبادەتی زۆر دەکردو خۆی زۆر ماندوو دەکرد، ڕۆژێکیان بینیم زۆر ماندووە بە عیبادەتەوە، پێیم ووت: خوای پەروەردگار زۆر بە ڕەحمە و کردەوەی چاکەی کەمیش وەردەگرێت لە بەندەکانی خۆی، ئەویش گریاو ووتی: ئومێدم ئەوەندە زۆرە بە خوا ئەگەر شاخەکان بیدەن بەسەر شانیاندا ناتوانن هەڵی بگرن بەڵکو بێتاقەت دەبن لە هەڵگرتنی، هەروەك چۆن بێدەسەلات بوون لە هەڵگرتنی ئەمانەت، جارییەکە ووتی: منیش دەزانم کە خوای پەروەردگار وەڵامی هەموو تاوانبارێك دەداتەوەو بە هانایەوە دێت، بەڵام دەبێ حاڵم چۆن

---

[٢٤٣] بڕوانە: صلاح الأمة في علو الهمة للدكتور سيد عفاني (٥/٢٥٣).

[٢٤٤] رواه الحاكم في المستدرك وصححه (٤/٥٧٤)، ووافقه الذهبي في التلخيص (٨٧١٣)، والألباني في "صحيح الجامع" (٢٠٠١).

بێت له دەربڕینی پەشیمانی له ڕۆژی پێشبڕکێی ڕاستەقینەدا؟ خالِدُ الوَرّاق
ووتی: دەربڕینی پەشیمانی له ڕۆژی پێشبڕکێی ڕاستەقینەدا مانای چییە؟
ئەویش: دەربڕینی پەشیمانی لە ڕۆژی پێشبڕکێی ڕاستەقینە بەرەبەیانی
ڕۆژی حەشـره، ئەو ڕۆژەی ئەوەی لـه نـاو گۆڕەکاندایـه دێنـه دەرەوە،
چاکەکاران به هۆی کردەوه چاکەکانیانەوه کەوتنـه ڕێ و پێشبڕکێیان کردو
پەڕینەوه بەسەر پردی (صِـــراط)دا، سوێند بـه خـوای پەروەردگار ئەو
کەسانەی کەمتەرخەمن و کردەوەی چاکەیان کەمه هەرگیز پێش ئەو کەسانه
ناکەون که چاکەکارن و چاکەیان زۆره، ئەگەر چاکەکاران به گاوڵکێش بڕۆن،
پاشان جارییەکه ووتی: ئەی هـاوار بۆ خۆم دەبێ چۆن لـه خەفـەتا نـەمرم
کاتێـك دەبیـنم چـاکەکاران پێـشبڕکێ دەکــەن و خێـرا دەڕۆن و ئـاڵای
چاکەکاریان بۆ بەرز کراوەتـەوه، وه پـردی (صراط)یـان بـڕی خۆشەویستان
گەیشتن به خوای پەروەردگار، وه منیش لەگەڵ خراپەکاران و تاوانباراندا بـه
جێ مام و دواکەوتم، پاشان دەستی کرد به گریان و ووتی: ئەی خالد با هـیچ
شتێك ڕێگریت لێ نەکات بۆ پێشبڕکێ کردن و کردنی کاره چاکەکان، چونکه
لــه نێـوان دونیــاو دواڕۆژدا شــوێنێك نییـه تــا کەمتەرخــەمان کاتێــك
کەمتەرخەمیان کردووه له خزمەتی گەورەکەیاندا (واته: خـوای پـەروەردگار)
قــەرەبووی بکەنــەوه، هــاوار بـۆ ئـەو کەسـەی کەمتەرخەمـه لـه خزمـەتی
گەورەکەیدا، وه لەگەڵ ئەوەشدا چەندین ئومێدو ئـاواتی پـێی هەیـه، دەی
خۆزگایــه کــردەوه چــاکەکان بــه ئاگــای بهێنایــه کاتێــك تەمبــەڵ و

کەمتەرخەمەکان نووستوون [٢٤٥].

لە کۆتاییدا دەڵێم: برای خۆشەویستم، خۆشکی بەڕێزم، هەر چاکەیەت خوێندەوەو بەر چاوت کەوت لەم کتێبەدا هەوڵبدە کەسانی تریش فێر بکە و لە ناو خەڵکیدا بڵاوی بکەوە، چونکە ئەو کارە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ڕزگارت دەکات لە ناخۆشی و ناڕەحەتیەکانی سەر پردی (صِـراط)، وە ڕێگەی تاریکی سەر پردی (صِراط)ت بۆ ڕووناك دەکاتەوە بە ویستی خوای پەروەردگار، چونکە ئەو موسڵمانەی ماندەری خەڵکییە بۆ کردنی خێرو چاکە وەکو ئەوە وایە خۆی ئەو چاکەکەیەی کردبێت.

داواکارم لە خوای پەروەردگاری باڵا دەست و خاوەن عەرش، هەموو لایەکمان لە ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی دواڕۆژ ڕزگار بکات بە گشتی، وە لە ناخۆشی و ناڕەحەتی سەر پردی (صِـراط) بە تایبەتی، وە بمانخاتە بەهشتەوە، وە مامەڵەمان لەگەڵدا نەکات بە خراپەی خۆمان، بەڵکو بە ڕەحم و بەزەیی و لێبوردەیی خۆی مامەڵمان لەگەڵدا بکات، بەڕاستی خوا لێبوردەیەو لێخۆش بووە لە تاوانی بەندەکانی، بەڕاستی خوا بیسەرو وەلامدەرەوەی پاڕانەوەکانە، وە سەلات و سەلامی خوای پەروەردگار بڕژێت بەسەر خۆشەویست و شەفاعەتکارمان لە دواڕۆژدا پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)، وە بەسەر یارو یاوەران و شوێن کەوتووانیان بە گشتی، آمـــین.

**تەواو بووم لە وەرگێڕانی ئەم کیتابە بە سوودە بە پشتیوانی خوای گەورە لە بەرە بەیانی ڕۆژی هەینی ١٦ جمادی الأولی ١٤٣١ کۆچی، بۆ هەر ڕەخنەو پێشنیارێکتان پەیوەندی بکەن بەم ژمارە مۆبایلەوە: (٠٧٧٠١٥٨٠٧٩٨).**

---

[٢٤٥] بڕوانە: صفة الصفوة لابن الجوزي (٢/٢٦٤).

# نـــــــاوەڕۆك

## بەشی سێیەم:

## بەشی چوارەم:

